رۆمان




# زستانێکی درێژ

## کولم تویبێن

وەرگێڕانی لە سویدییەوە:

**دلاوەر قەرەداغی**



# زستانێکی درێژ

## کولم تویبێن




وەرگێڕانی لە سویدییەوە:

دلاوەر قەرەداغی



ناوەندی ڕۆشنبیریی و هونەریی ئەندێشە
بەڕێوەبەری چاپ و بڵاوکردنەوە: دانا مەلا حەسەن
بەڕێوەبەری هونەری: باسم ڕەسام

ناوی کتێب: زستانێکی درێژ
ناوی نووسەر: کولم تویبێن
وەرگێڕانی لە سویدییەوە: دلاوەر قەرەداغی
بابەت: ڕۆمان
نۆبەتی چاپ: یەکەم ٢٠١٣
چاپخانە: رجایی / تاران
تیراژ: (١٠٠٠) دانە
نرخ: (٦٠٠٠) دینار
ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (١٨٥٧)ی ساڵی (٢٠١٣)ی پێدراوە.

ئەم کتێبە لەم سەرچاوەیەوە کراوە بە کوردی:

A Colm Toibin, En Lång Vinter,
översättning: Erik Andersson,
Nordets, Stochkholm 2012

ناوەندی ڕۆشنبیریی و هونەریی ئەندێشە/ئەندێشە بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
سلێمانی-شەقامی مەولەوی-تەلاری سیروانی نوێ-نهۆمی چوارەم
www.endeshe.org ● andesha.library@yahoo.com
http//www.facebook.com/Andeshacenter
07501026400

ئەو مەودا هەستییەی کە لە نەسری (کولم تویبێن)دا هەیە، هێند بەرفەراوانە، کە ناتوانرێ ڕۆمانەکانی بە "غەمگین" یان "شاد" نێوزەد بکرێت.

جەفری کەنت یوگەنەدیس

کولم تویبین، لەدایکبووی ساڵی ١٩٥٥، زۆر کەس بە گرینگترین نووسەرانی هاوچەرخی ئایرلەندای دەزانن. ساڵی ٢٠١١ خەڵاتی بە هەیبەتی پێنی ئایرلەندی وەرگرتووە. جگە لەم ڕۆمانە، تا ئێستا سێ ڕۆمانی تری ئەو نووسەرە بۆ سوێدی وەرگێڕدراون و چاپ کراون: خەلەنگێکی بلێسەدار ١٩٩٥، شەوی دەرەوە ١٩٩٧، مامۆستا ٢٠٠٥. تویبین بە شێوەیەکی بەردەوام لە London Review of Books دەنووسێت و لە هەر سێ شاری دبلن و نیویۆرک و کاتالۆنیا دەژی.

ئیریک ئەندێرشون، وەرگێڕی ڕۆمانەکە بۆ سوێدی، لەدایکبووی ساڵی ١٩٦٢ ە، یەکێک لە نووسەر و وەرگێڕە جێگە سەرنجەکانی ئەمڕۆی سوێدە زیاتریش بەهۆی وەرگێڕانەکانییەوە لە جەی ئار تولکەین و جێمس جویس. دوو کتێبی خۆیشی لەبارەی ئیشکردن لەو وەرگێڕانانە و چەند ڕۆمان و کۆمەڵەچیرۆک و کتێبی دەقی ئەدەبیی هەن.



گەرچی تا دەهات ڕۆژ کورت و کورتتر دەبۆوە و ئێوارەکان تاریک و تاریکتر دەبوون، کەچی هەوا شێرەوگەرم بوو. میکوێل لە پەنجەرەی ژووری نووستنەوە، باوکی و جوردی بینین لە کێڵگەکانی خوارەوە بەرەو پشتیرەکە دەبوونەوە. هەردووکیان کراسی قۆڵ کورتیان لەبەردابوو وەک ئەوەی دونیا هێشتا هاوین بێ.

ئێوارەی پێشتر باوک لەکاتی شێوکردندا، وتبووی: "ئەم ساڵ زستانمان نابێت. قەشەگەل وتوویانە: ئەوە پاداشتمانە چونکە وەفادارانە نزا و

نوێژمان کردووە و یارمەتی هاوتوخمەکانی خۆمان داوە".

میکوێل زۆری بۆ خۆی هێنا پێنەکەنێ، تا وا بنوێنێ ئەو قسەیەی باوکی دەسەلمێنێ، ڕۆڵێک کە جوردی بە بینینی ڕاهاتبوو. بەڵام جوردی و دایکی بێدەنگ دانیشتبوون. ئێستا جوردی بە دەگمەن قسانی دەکرد و تەنانەت ئەگەر کەسێک پرسیاری لێ کردبا، بە ئامارەش وەڵامی نەدەدایەوە. ئاخر ڕۆژی شەممە بۆ "لا سێو" یان دەگەیاند تا سەری بە شێوەیەکی تایبەتی بتاشرێت و ڕۆژی سێ شەممەش بەرەو خزمەتی سەربازیی بەڕێ دەکەوت. جوردی دوو ساڵ لە ماڵ دوور دەکەوتەوە.

هەفتەیەک لەوەوبەر، کاتێ ناوی بۆ سەربازی هاتەوە، لە میکویلی پرسی بوو، ئەرێ ئەوە چۆناوچۆنییە کە بە زیلێک بۆ "لێریدا"ت دەبەن، ئیمزای وەرگرتنی جلکە سەربازییەکانت دەکەیت،

شـــــەو وەک ســـــزادراوێک لە بنکەیەکـــــدا ڕۆژ دەکەیتەوە، خواردنی ئەوان دەخۆیت و پاشان بە قەتـار بەرەو "زاراگـۆزا" یـان "مەدریـد" یـاخود "ڤالادولیـد"، یـان هەر جێگەیەکـی تـر، کە ئێسـتا خەڵکی بۆ دەنێرن، دەتبەن.

میکوێل وتبووی:" ڕێـک وەک ئەوەیە کە خـۆت باست کرد".

جوردی وتبووی:" ئا، بەڵام دەمەوێ بزانم ئەوە چۆناوچۆنییە؟"

میکوێل شانی هەڵتەکاندبوو، نیگای لە نیگـای جـوردی ئـالابوو، چ قسـەیەکی نەبووبـوو بیڵێـت. ئاخر ئەوە شـتێک بـوو ئەوەی نەدەهێنـا نە بیـری بکەوێتەوە و نە باسیشی بکات. بەبێ ئەوەی خۆی ویسـتبێتی، کەوتبـووە وەبیرهێنـانەوەی هەنـدێک وردەکاریی ئەو دوو ساڵەی ژیانی سەربازیی خۆی، بەڵام کاتێ بینبووی جوردی ترسی لـێ نیشـتووە، ئیدی متەقی نەکردبوو.

جوردی کە پـێ دەچـوو زوربەی کاتەکـانی ئەو ڕۆژانەی دوایی لە ماڵەوە، خـۆی بە نەوازشـکردن، یـان یـاریکردن لەگەڵ "کلـوا"، لەگەڵ سـەگەکەیدا بەسـەر بەرێـت، لەوکـاتەوە هـیچ قسـەیەکی لەگەڵ میکوێلدا نەکردبوو. بەڵام هـیچ پـێ نەدەچـوو لێـی تـووڕە، یـان دڵـی لێـی ئێشـابێت، چـونکە ئەگەر ئەوان نەیانتوانیبا ڕاشکاوانە لەبارەی ئەو ڕاهێنـانە سـەربازییانەوە، کە دەبـوو ئەم بیانکـات، قسـان بـکەن، ئەوا وا چـاکتر بـوو هەر هیچـی لەبـارەوە نەڵـێن. تەنـانەت لەو ژووری نووستنەشـدا، کە هەردووکیـانی تێـدا دەخەوتـن، کـاتێ جلەکانیـان دادەکەند، یاخود گڵۆپیـان دەکوژانـدەوە، هیچیـان نەدەوت. میکوێـل تەواو لێـی ڕوون بـوو، کە بەو زووانە تەخـتەخەوە یەک کەسـییەکەی ئەو ژوورە بچکۆلەیە چۆڵ دەبێت، پێیوابوو دایکی بەرگەنوێن و سەرچەفەکانی دەپێچێتەوە و تا کاتێ براکەی لە

مـــاڵ دوور دەبێـــت، دۆشـــەکەکە بە ڕووتوقـــووتی دەهێڵێتەوە.

زیـــاتر لە تـــرس و برســـێتیی و نـــاڕەحەتیی بەردەوام، میکوێـــل لە ڕاکێشـــانی مـــاوەی سەربازییەکەیدا، سـەبووری خۆی بە خەون بینـین بە مـاڵەوە دابـۆوە. لە مانگەکـانی سـەرەتادا، لە کاتێکـدا ڕاهێنـانی بێمانایـان لەژێـر هەتـاوێکی دڵڕەقانەدا پێ کردبوو، حەزی کردبوو بزانێ ئـاخۆ بۆچی قەت ژیـانی خـۆی لەنـاو خێزانەکەیـدا، وەک شتێکی ناسک و بە بەها نەبینیوە. میکوێل خەونی بە بەیانیانە ساردەکانەوە بینیبوو کاتێ باوکی لە خەو خەبەری کردبـۆوە تـا بە جێـبەکە لەگەڵیـدا بڕوات بۆ ئەو جێگە هەڵەتانەی ڕانەمەڕەکەیـان بـۆ لەوەڕی هاوینە بۆ دەبردن. خەونی بە جـوردییەوە بینیبوو، کە حەزی کردبـوو بنـوێ و لەگەڵ خۆیـدا سێودووی ئەوەی کردبوو ئاخۆ لەگەڵیان بچێت یان نـا. خەونـی بە تەختـەخەوەکەیەوە بینـی بـوو، بە

ژووره زۆر ئاشناکەوە، بە دەنگەکانی بەیانیی و ئێوارانەوە، بە کوونەپەپووەکەی نزیک پەنجەرەکەوە لە هاویناندا، بە تەقەتەقی زەوینە تەختەییەکەوە کاتێ دایکی شەوان لە خەو هەڵدەستا، خەون بە ڕانە مەڕەکەوە، کە زستانان دەهێنرانە خوارەوە بۆ پشتیرەکە و خەون بە باریکەڕێیەکەی گوندەوە، کە پڕ لە باعەباعیان دەبوو.

هەموو ڕۆژێک نەخشەی بۆ گەڕانەوەی چنی بوو، بە وردەکارییەکانییەوە پەرۆشی گەڕانەوە بوو، ڕۆژانە بە چاوەڕوانیی ئەوەوە دەژیا کە شتێک، چێژێکی بچکۆلانەی ژیانی ماڵەوە — دەنگی جێبێک کە دەکەوتە ئیش، دەنگی مشارێکی ئەلەکتریکی، تەقەی تاپڕی ڕاوچییەک یان حەپەی سەگێک — ی یاد بێنێتەوە، ئەوە بە لایەوە وەک ئەوە وا بووە، کە هەر بە ڕاستی گەڕابێتەوە و سەرلەنوێ لەدایک بووبێتەوە. هێند

نزیک لەگەڵ خەونەکانی گەڕانەوەی بۆ ماڵ و ژیانە سەرابییە دڵنیا و ئازادەکەیدا ژیابوو، هیچ لە خەیاڵی ئەوەدا نەبووبوو، کە بەو زووانە نۆرەی جوردییە، کە بەو زووانە براکەشی تاڵاوی سەرتاشینە سووکایەتیهەژێن و چاوەڕوانییە سارد و دوورودرێژەکەی ناو زیل، کە بۆ لێرید+ ی دەبەن، بە گەروویدا دەچێ. میکوێل دەیزانی ئەوە بۆ براکەی چەندە زەحمەت دەبێت، دەتوت بەشێکی نازک و پاقیژە لە خۆی دەڕوا و قژی هەڵدەپاچڕێ و تەختەخەوێکی چۆڵوهۆڵ لە دوای خۆیەوە جێدەهێڵێت.

لەم چەند هەفتەیەی دوابیدا، دایک کێچ کەوتبووە کەولی. هەندێجار میکوێل وا مەزەندەی دەکرد، دایک لە هامشۆی بە نێوان موبەق و هۆڵی درێژکۆلەی نانخواردن و کلوختەکەدا، بە دوای شتێکدا بگەڕێت. میکوێل دەیزانی لەو کاتەوەی لە سەربازی گەڕاوەتەوە، نائارامییە گەورەکەی دایک

دەستی پێ کردووە. زۆر بەسەر گەڕانەوەی دا تێنەپەڕی بوو، کە میکوێل سووسەی ئەو نائارامییەی کردبوو. پێیوانەبوو کاتێ ئەو لێرە نەبووە، دایک وا بوو بێت، لەبەرئەوەی جوردی هیچ شتێکی لەوبارەیەوە بۆ باس نەکردبوو. ئێستاش وا پێ دەچوو ئێجگار لەوە نائامادەتر بێ کە هەست بە هیچ شتێک بکات.

دەستەوەستانیی دایک بۆ هێوربوونەوە، وەک ئەوەی دۆخەکەی بە کەشوهەواوە ڕایەڵ بێ، لە هەڵکشان و داکشاندا بوو. لەو ڕۆژانەی دواییدا، کە جوردی ئامادەی ڕۆیشتن بۆ خزمەتی سەربازیی دەبوو، دایک زیاتر و زیاتر گرژ و پەشۆکاو، دەهات و دەچوو. میکوێل پێیوابوو دایکی لە ئاژەڵێکی نامۆ و برسی دەچێ کە لە لایان بژی، بە حاڵ دەیتوانی چێشت لێ بنێ، یان خوان بڕازێنێتەوە، بە حاڵ ددانی مریشک و کەروێشک و قازەکانی پێ دەدرا. میکوێل دەیویست بزانێ ئاخۆ بۆچی دایکی

ئاوها بە سەفەرەکەی جوردی نیگەرانە، ئاخر کاتێ ئەم خۆی بەرەو سەربازیی دەڕۆیشت، دایک بەم جۆرە هەڵسوکەوتی نەکردبوو.

بەڵام ئێستا کاتێ بەرچاییان کرد و بە نیازبوون بەرەو خوار، بەرەو لا سێو بێئاژوون، دایک بێ جووڵە لەلای مێزەکەوە دانیشتبوو، جوانترین جلکەکانی پۆشیبوون، شپرزە و بێدەنگ، بەڵام لە چاو چەند هەفتەی ڕابردوودا، گردەوەتر بوو.

میکوێل بیری کەوتەوە کاتێ لە خزمەتی سەربازیی گەڕایەوە، لێوانلێو بووبوو لە شادمانیی، هیچ حیسابی بۆ ئەمە نەکردبوو، کە لە دوای جێبەکەدا دادەنیشێ و جوردی لە تەنیشتەوە دەبێ و دایک و باوکیش لە پێشەوە سوار دەبن وەک ئەوەی جوردی بۆ فرۆشتن و سەربڕین ببەن. کاتێ جێب کەوتە ئیش و بەنێو ناوچە ئاشناکاندا ملی نا، میکوێل توانی قەیرێک خۆی بەوە فریو بدا، کە بۆ ڕۆژانەبازاڕێکی ئاسایی دەڕۆن، نە زەمیلە

هێلکەیان پێیە بۆ فرۆشتن و نە لیستی چ شمەکێکیش کە دەبێ بیانکڕن، بەڵام پاشان ڕاستییە تاڵەکەی لەبارەی سەفەرەکەی جوردی و نیگەرانییە دێرینەکەوە، وەبیرهاتەوە.

باوک دەبوو لەگەڵ جوردی دا بچن بۆ سەرتاشخانەکە: کابرای سەرتاش بە تووڕەوتڕۆیی ناسراو و سووسەی شیوعێتیشی لێ دەکرا. لە دوای جەنگ چەند ساڵێکی لە زینداندا ڕاکێشا بوو. بەو شێوەیە جوردی دڵنیابوو لە کاتێکدا بە پێی ڕانومابیە سەربازییەکان سەری دەتاشرێت، دەبێ واز لە سوحبەت و پلاری خۆش بهێنێت. سەرتاشەکە دەبوو هێند پارێزگاری بە ڕەزا تاڵییەکەی خۆیەوە بکات، کە ڕێزی جوردی لە خۆی، دابەزێنێت.

ئەو ڕۆژە نە هێلکەیان پێ بوو و نە پەلەوەر تا بیانفرۆشن، بەڵام دەبوو خواردەمەنی بکڕن. تەنانەت دەبوو سەوزەواتیش بکڕن لەبەرئەوەی

باخچۆکەکەیان لەو هەفتانەی دواییدا چ بەرهەمێکی ئەوتۆی نەدابوو. میکوێل و دایکی کە هەریەکەیان دوو زەمیلەی پێ بوو، لە سەرتاشخانەکە بەنگ نەبوون، بەڵکو وایان بڕیاردا سەعاتێکی تر، باوک و جوردی لە هەمان گۆڕەپان ببیننەوە.

کاتێ میکوێل و دایکی تەنیا کەوتنەوە، هەنگاوەکانی دایک سووکەڵەتر بوون، پێدەچوو تا ڕادەیەک شاگەشکە بووبێ کاتێ خۆی بە گۆڕەپانەکەدا کرد، بە شادمانییەوە سڵاوی لە دۆست و برادەران لەودیو مێزی شتفرۆشتنەکانیانەوە دەکرد، بە شانازییەوە بە یەکێکیانی وت ئەمڕۆ ئەو هیچ شتێکی بۆ فرۆشتن پێ نییە، بەڵکو ئەمڕۆ تەنها بۆ شت کڕین هاتووە، پێکەنی کاتێ ژنە فرۆشیارەکە وەڵامیدایەوە، کە ئەگەر هەندێ کەس وەک ئەویان کردبا، ئەوا هەموو دوکاندارەکانی گۆڕەپانەکە، بۆ خۆیان دەوڵەمەند دەبوون.

پاشان دایک، میکوێلی بەجێهێشت. پێیوت چاوەڕێی بکات، شتێک هەیە دەبێ بیکات، دەڕوا و زوو دەگەڕێتەوە. وای وت و یەکسەر تێی تەقاند، وەک ئەوەی پێیوابووبێ ئەگەر بۆ یەک تاقە چرکەش ماتڵ بێ، ئەوا میکوێل گلی دەداتەوە. میکوێل، دایکی بینی، خۆی کرد بە نێوان دوو مێزی شتفرۆشتندا و هێشتا زەمیلەکانیشی هەر بە دەستەوە بوون.

میکوێل بیری کردەوە ئەگەر شتێکی هەبێت بیەوێت بیکات، ئەوا وا باشە بچێت زەیت بکڕێ، یان ڕاسپاردەی گاسۆلین بکا تا کاتێ ئێوارە دەگەڕێنەوە، ئامادە بێت. تەماشای گوڵفرۆشەکانی کرد، کە دوو ژن بوون، قاییلمەند دەبینران ئەگەرچی ئەوان تاقە فرۆشیارانێک بوون، کە سەرە لەبەر مێزەکانیاندا نەگیرابوو. میکوێل لە فیکرەوە چوو، ئاخر چما کێ پارەی لێ زیادە تا گوڵی پێ بکڕێ.

پاشــان میکوێــل زیــاتر و زیــاتر بێزاریــی دایـدەگرت، چـاوەڕێکردن شـتێک بـوو بنیـادەمی شەکەت دەکرد. میکوێل پێیوابوو دایکی چووە بـۆ قەسـابخانە، یــان مریشکفرۆشــییەکە و دەشــێ خەڵکی زۆر لێ بن، یان ڕێشی تێدەچێ چووبێ بۆ دەرمانخـانەکە تـا دەرمانێـک بـۆ شـتێکی تـایبەتی خۆی بکڕێت. دوای ساتێک ئەمیش ڕۆیشـت، وەک ئەوەی دایکی کـردی، ئەمـیش بەنێـوان دوو مێـزی شتفرۆشـتندا بەرەو ڕیــزە دوکانەکـانی ئەوبەر، کە پێیوابوو لەوێ دایکی دەبینـێ و دەتـوانن پـێکەوە چـاوەڕێ بـکەن، ڕۆیشـت. ئەگەر لە دەرمانخـانەکە بیبینــێ ئەوا لە دەرەوە چـاوەڕێی دەکـا. خـایلەی ئەوەی کە لە نزیک دایکییەوە لە ڕیزێکدا ڕابوەستێ و کیسەکانی بۆ هەڵبگرێ، بە لایەوە شـتێکی هەر زۆر خــۆش بــوو. ئــاخر دایکــی هەمیشــە لەگەڵ خەڵکیدا دەمولەپز شیرین بووە — لەگەڵ خەڵکانی نەدیوونەنــاس و لەگەڵ دوکاندارەکانــدا — خـودان

جۆره دڵڕفێنییه‌ک بوو، که‌ وای له‌ خه‌ڵک ده‌کرد دڵی خۆیانی بۆ بکه‌نه‌وه‌ و وایشی له‌ میکوێل ده‌کرد حه‌ز بکا له‌و ساتانه‌دا کاتێک دایک به‌ده‌م که‌سێکه‌وه‌ زه‌رده‌خه‌نه‌ی دێتێ، یاخود توانج له‌ شتێک ده‌دا، له‌ ته‌نیشتییه‌وه‌ بێ. ئه‌وه‌ تا ڕاده‌یه‌ک هه‌ستێک به‌ شانازیی به‌خۆکردنی تێدا ده‌خوڵقاند.

دایکی له‌ ڕیزی به‌رده‌م قه‌سابخانه‌که‌دا نه‌بوو، ڕیزه‌که‌ درێژ بوو، بڕیاریدا به‌ جاده‌که‌دا به‌ره‌و لای مریشکفرۆشییه‌که‌ سه‌رکه‌وێ، له‌و کاته‌دا کتوپڕ چاوی به‌ دایکی له‌ودیو جامی مه‌یخانه‌یه‌که‌وه‌، که‌ پێشتر قه‌ت سه‌رنجی نه‌دابوو، که‌وت. ویستی ته‌قه‌ له‌ جامه‌که‌ بدا و چاوه‌ڕێ بکا تا ئاوڕی بۆ بداته‌وه‌ و بزه‌یه‌کی بۆ بکا، به‌ڵام ڕوخساری خاوه‌ن باڕه‌که‌ ئیستی پێ کرد. میکویل بینی چۆن خاوه‌ن باڕه‌که‌ چه‌ند دراوێکی ژمارد و به‌ره‌و لای ڕیزێک بوتڵ، دوور له‌وسه‌ری کارمه‌زه‌له‌که‌وه‌، چوو. په‌رداخێکی گه‌وره‌ی له‌و په‌رداخانه‌ی که‌ بۆ ئاو خواردنه‌وه‌

بەکاردێت، پڕ لە شلەمەنییەکی ڕوون و زەرد، زەرد وەک چای ڕوون یان شێرییی* ، کرد، ئینجا دەستی دایێ و بۆ دایکی میکوێلی برد. میکویل مەزەندەی کرد ئەو شلەمەنییە فینۆ** یان شەرابی هەرزان، یاخود موسکات بێ. میکوێل دایکی بینی پەرداخەکەی وەرگرت و بە دوو قووم چۆڕبڕی کرد، بەرلەوەی چاو وەرگێڕێ، سەرنجی دوو پەرداخی تری بەتاڵی لە نزیکییەوە لەسەر کارمەزەلەکە، لە هەمان ئەو پەرداخانەی کە هەر ئێستا پێی خواردبوونەوەدا. بە پەلە گەڕایەوە بۆ ئەو جێگەیەی دایکی لێ جێهێشتبوو. بەو زووانە دایکی کولم سوورهەڵگەڕاو بە چاوانێکی پڕ لە شادمانییەوە، دەگەڕایەوە ئەوێ بۆ لای و پێکەوە

---

* Sherry شەرابێکی بەهێزە.

** Fino جۆرێکە لە شەراب.

دەستیان بە کڕینی شمەکەکانی ڕۆژانەیان دەکردەوە.

میکوێل دەیزانی ئەوەی بینیویەتی چییە و تێی دەگەییشت. ئێستا ئیتر دەیزانی دایک بۆچی بە تاقیتەنیا ملی ڕێگەی گرت و ئەمی بەجێهێشت، ئاشکراشە کە بۆچی ئەوەندە شادمان بووە، نزیکەی بێ غەموخەفەت دەینواند کاتێ یەکەمین شمەکی کڕی. هەروەها لەو شتەش تێگەییشت، کە دەمێک لێڵوپێڵ لێی بەئاگا بوو-دەمێک کە بۆنی هەناسەی، حولحولێتیی و نائارامییەکەی، هەموو شتێک ئاماژەیان بۆ هەمان ئاراستە دەکرد- بەڵام نەیوێرابوو بگاتە ئەو ئەنجامگیرییە دروستە. ئاخر دایکی پەرداخە شەرابەکەی بە هەمان شێوەی تینوویەک قلْپانده خۆیەوە، کە کاتێ بین بە پەرداخێک ئاوەوە دەنێ. دەبێ دوو پەرداخەکەی تریشی بە هەمان پەرۆشییەوە هەڵقوڕاندبن. جگە لەوە چ ڕاڤەیەکی دی بۆ ئەوە نەبوو. لە خایلەی

ئەوەدا بوو ئاخۆ دایکی ئەو برە خواردنەوەیەی بەسە و دەبێ چەندێک بەو پەرداخە شەراب، یان شیری، یان نازانم چی و چییە داسەکنێ، بیری کردەوە ئەدی ئەگەر پێویستی بە خواردنەوەی زیاتر یان بەهێزتر بێت، چیی؟ ئەی باشە تۆ بڵێی باوکی بەمەی زانیبێ، یان جوردی زانیبێتی. پێیوابوو باوکی بەوەی زانیوە، چونکە هەموو شەوێک لەگەڵیدا لەسەر هەمان تەختەخەو ڕادەکشێ، دەزانێ ئەو سەرحاڵیی و شادمانییەی لە کوێوە بۆ دێ. هەڵبەت میکوێل لەو چرکەساتە دڵنیا نەبوو ئاخۆ دایکی کەی دەستی بە خواردنەوە کردبێ: دەشێ لە سەرەتای بازاڕکردنێکدا لە لا سێو بووبێ، بەڵام ئەوە نەدەچووە ئەقڵییەوە. خۆ تەنانەت ئەگەر ماوەکە درێژ بێ و بۆ کاتێکی زۆر لەمەوبەر بگەڕێتەوە، ئەوا شتێکی ئاساییە، کە باوکی هیچی لەو بارەیەوە بە زاردا نەهاتبێ، یاخود شتێکی لەگەڵ

نەکردبێ، بەڵکو لەبری ئەوە وەک یەکێک لە ڕوانگە خۆشەکانی ژیان بە زەینی سپاردبێ.

کاتێ سەوزەواتەکانیان کڕی و لە نانەواخانەکە هاتنە دەرەوە، دایک لەگەڵیدا کەوتە قسان، تێبینی کرد دایک سەری دوور ڕادەگرێ تا ئەم بۆنی هەناسەی نەکات.

دایک وتی: "کاتێ تۆ بۆ عەسکەریی ڕۆیشتیت، وا پێ دەچوو قەت نەگەڕێیتەوە، بەڵام لە ڕاستیدا خێرا تێپەڕی. زۆر ناخایەنێ جوردی - ش دەگەڕێتەوە".

لەبەردەم قەسابخانەکەدا لە ڕیزدا ڕاوەستان، میکوێل لەوێدا پێیوابوو، دەبوو زووتر دایکی بدۆزیبایەتەوە. ئێستا هەموو شت جیاواز دەبوو ئەگەرچیش جیابوونەوەکەیان تەنها پازدە دەقیقەی بەین بوو. ئێستا ئیدی بە خانەگومانییەکی نوێوە گوێی لە دەنگی دایک ڕادەدێرا و دەیبینی چۆن جووڵەی تێ گەڕاوە. لە فیکرەوە چوو، دەشێ لەو

ئەنجامگیرییەیدا ئێجگار پەلەی کردبێ. دەشێ ئەوە یەکەم تاقە خواردنەوەی هەفتەی بێت و پێی داسەکنێت، بیری کردەوە دایک تەواو حەقی خۆیەتی بە پەرۆشەوە تاسەی خواردنەوەی کردبێت، چون لە گوندێکی بێ بار، بێ دوکان و بێ هیچ شتێکدا دەژیا کە جگە لە دراوسێی چاوچنۆک و زستانێکی درێژ، هیچی تری لێ نەبوو.

دایک، ژنی قەسابەکەی دەناسی، زۆر جاران کەروێشکەکانی لەوێ دەفرۆشتن. ئێستا کاتێ بۆی باس کرد جوردی بۆ سەربازی دەڕوا، هەموو ژنەکانی چواردەور کەوتنە ئاخوئۆف، کاتێ ژنی دوکاندارەکە چاوی بە میکوێل کەوت، زەردەخەنەی هاتێ و وتی خۆشبەختانە دایکی، یەکێکی ئاوها باڵابەرز و خورتی ماوە. ئەو ژنە وتی دەکرێ خۆی بە بەختەوەر بزانێ ئەگەر بەو زووانە ژن نەهێنێ. یەکێک لە ژنەکان خۆی هاویشتە نێو وتووێژەکەوە

و وتـــی کیژێکـــی هـــاوتەمەنی ئەوی هەیە و گەر بـیەوێ ئەوا بـۆ خۆیـان دەبـنە پێرێکـی جـوان. میکوێل زەردەخەنەی هـاتێ و وتـی کـاتی بـۆ ئەو جـۆرە شـتانە نیـیە، ئێسـتاش کە جـوردی دەڕوا، شت زۆرە دەبێ خۆی بۆیان تەرخان بکات.

کە جوردی — یان بینییەوە، کڵاوێکی لەسەردا بوو. دەمـی بـۆ میکوێـل خـوار کـردەوە و دەسـتی خستە سەر شانی. لەگەڵ دایک و باوکیاندا بە لای مێزی شتفرۆشییەکاندا تێپەڕین. لەو نـاوە پەنیـر و زەیتوون لە بارێکی بچکۆلانەی تەنیشت وێسـتگەی پاسەکان دەفرۆشرا و لەوێ بوکادیللۆ* و ساردییان کڕی.

* Bocadillo بـــابۆڵەیەکی میللـــی ئیســـپانیی و ئەمریکای لاتینە بە نانی ئیسپانییەوە زیاتر لە قاوەخانە و بارەکاندا دەخورێت.

میکوێـل وتــی: "ورده ورده دەبــێ خــۆت لە کڵاوەکە بدزیتەوە".

جـوردی وەڵامیـدایەوە: "نیـازم وایە تـا دوایـین دەقیقە هەر بە سەرمەوە بێ".

لە بێدەنگییەکـدا کەوتــنە خــواردن تەنهــا بە توانجەکـانی بـاوک دەشـکا، کە لەبـارەی شـتێکی تـایبەتییەوە نەبـوون، بەڵکـو لەبـارەی مشـتەریی، مـاتڵبوون لە سـەرەی دوکـانی خۆراکفرۆشـییەکان یـــان نرخـــی شـــتە جۆراوجۆرەکـــان بە نرخـــی سەرتاشینی شیوعییانەشەوە، بوون. میکوێل هـیچ پاسـاوێکی بـۆ وەڵامـدانەوە نەدەبینـی و سەریشـی سورما جـوردی — ش هەمـان هەڵوێسـتی هەبـوو. بیری کردەوە، کاتێ ئەم خـۆی دوور بـووە، بیـری توانجەکانی باوکی کە لەبارەی هەموو شتێکەوە لە نێوان ئاسمان و ئەرزدان، نەکردووە، بەڵام جوردی بە ڕەحمتــرە، زیــاتر بە دەربەســتی خولقانــدنی هارمۆنییەتەوەیە، میکوێل دەیزانی هەر کە براکەی

جێیان دەهێڵێ، ئیتر بیری هەموو شتێکی ئێرە دەکات. میکوێل دەیبینی دایک چۆن بەختەوەرانە لە دەوروبەری خۆی دەنۆڕێ و لێوی بە پەرداخێک ئاو تەڕ دەکا.

پاشان لە یەک هەڵبڕان، دایک بە تەنها ڕۆیشت تا هەندێک شمەکی پێویست بکڕێ و پیاوەکانیش ڕۆیشتن تا مشووری گازۆیل بخۆن و تەماشای مشارێک بکەن، کە باوک لە جامخانەی دوکانێکدا بینیبووی. میکوێل دڵنیابوو باوک پێویستی بە هیچ مشارێکی نوێ نەبوو، بەڵام دەشێ لە هەر شتێکی تر زیاتر، پێویستی بە شتێک بووبێ تا ئێستا خەیاڵی خۆی پێ پەرت بکات. میکوێل سەرنجی باوکی دەدا خۆی خواپێداو و شێلگیر پیشان دەدا تا سەرنجی بە ملۆمۆی دوکاندارەکە بە لای خۆیدا ڕاکێشێ و پاشان ببینێ مشارەکەی لە جامخانەکە بۆ دەردێنێ. میکوێل بینی چۆن باوکی داوای پارچە تەختەیەکی کرد تا مشارەکەی

پێ تاقی بکاتەوە، باوک بێ حەجمین ڕاوەستاو و قڵافەتی دارتاشێکی حیسابیی لە خۆگرتبوو تا ئەو کاتەی پارچە تەختەکەی بۆ هێنرا. کاتێ بۆی هات، کەوتە سەر ئەژنۆ و مشارەکەی لەسەر دانا، گرژ و ناوە ناوە تەماشای دوکاندارەکە و پاشان هەردوو کوڕەکەی دەکرد و چ بایەخیشی بەو هەندە تەماشاچییە نەدەدا کە لە دەوریان کۆببوونەوە، تا وەک میکوێل مەزەندی دەکرد، بە ئەنقەست وا بنوێنێ دەمی مشارەکە هەر زۆر کولە. کاتێ قاییلمەند لەوەی ئەنجامی دابوو، بووەوە، هەستایەوە سەرپێ و ئاردەدارەکەی لە دەستی تەکاند.

کاتێ بە ترومبێلەکە هاتن و دایکیان هەڵگرت، میکوێل و جوردی بازیان دایە خوارەوە تا کارتۆنەکە بهێنن، دایکیان پێی وتن جارێ زەیتەکە ئامادە نییە. وتی لەم هەفتەیەدا بۆیان دەنێردرێت.

کاتێ باوک پێشنیاری ئەوەی کرد دەی با لە

دوکانێکی تر زەیت بکڕن، دایک وتی نەء پارەکەی داوە. وتــی ئەوە باشــترین زەیــت و بە هەرزانتــرین نرخیشــە، دوکانــدارەکەش بە نەزاکەتەوە بەڵێنــی داوە لە مــاوەی چەنــد ڕۆژێکــدا بۆیــان بنێرێــت. میکوێل سەرنجی دا دایکی خەریک بوو هاوسەنگی لەدەست دەدا، لەو کاتەدا کە قسانی دەکرد، هەر ئێجگار بە وردی ڕوونی دەکردەوە زەیتەکە چۆنە و چۆن نییە. باوکیان، کە ئێستا خەریک بوو لە شار دەردەچــوو، وتــی دوکــانێکی بەبــێ زەیــت وەک زســتانێکی بــێ بەفــر وایە، ئەوە شــتێکی ئاســایی نیــیە، هەر هــیچ ئاســایی نیــیە. وای وت و لەبەر خۆیەوە دەخەنی.

جــوردی دوو ڕۆژی تــری مــابوو لە لایــان بێــت. ئەو شەوە کاتێ چوون بۆ ژووری نووستن و لەنێــو بێــدەنگییەکی هەســتیاردا نــوێنەکەی خــۆی چــاک کرد، میکوێل هەموو شتێکی لە زەینیدا تۆمار کرد تا دواتر ئەو شــتانە، لە بچــووکترین وردەکارییانــدا

یــادبێنێتەوە – داخســتنی دەرگە کــاتێ ئەوان لە
ژوورەکەدا بە تەنهان، تەقەتەقی زەوینی ژوورەکە،
دابەشــــکردنی ئەو ڕووبەرە تەنــــگەبەرە لەنێــوان
خۆیانــدا بە جۆرێـک کاتێـک جلیـان دادەکەنـد و
خۆیان دەگۆڕی، مەزاحیمی یەکتـر نەبن، سێبەرە
لێڵەکانیان لەسەر دیوارەکە. میکوێل سەرنجی دا،
وەک ئەوەی یەکەمجار بێ ئەوە ببینێ، جوردی لەم
خاووخلیچکترە، بەڵام ئەو لەم بە ئەتەکێت تر بوو،
زۆر وردتــــر بــــوو لە قەدکردنــــی جلکەکانیــــدا،
بیجامەکەی بە جوانی و قەدکراوی دەخستە ژێر
باڵشتەکەیەوە. لە سەربازییدا، لەو هۆڵە درێـژانەی
نووســتن و لە مــۆڵگەیەکی گەورەدا، خــووی لەو
جۆرە، بە هاسانی دەبێتە بابەتێک بۆ سەرکردنە
سەر و پێ ڕابواردن.

میکوێل سەرنجی جوردی دەدا کاتێ کە پشتی
لێی بوو، بە هێوری بلوسەکەی دادەکەند و لەسەر
بیرۆکە بۆ بەیانی دایدەنا. میکوێل وا ڕاهاتبوو بەر

لە بـــراکەی دەچـــووە جـــێگەوە. ورد بـــوو لەوەدا کاتێـک خـۆی دادەکەنـد و بیجـامەی لەبەردەکـرد، ڕێک تەماشای نەکـا، لەبـری ئەوە دەسـتی دەنـایە پشت سەر و لە بنمیچەکە ورد دەبۆوە، تا ڕادەیەک باوکی ئاسا توانجی لەبارەی هەموو شتێک لەنێوان ئاسـمان و ئەرزدا دەدا، جاروبـار لاسـایی بۆڵەبۆڵ کـــردنە ڕۆژانەیـــیە بـــێ غەرەزەکـــانی بـــاوکی، بـــۆ دڵخۆشکردن و زەندەق بردنی جوردی، دەکردەوە.

ئەو ژیانە خێزانییە وا لە کۆتایی نزیک دەبۆوە. جوردی دوای تەواوکردنی خزمەتی سەربازییەکەی، لە وادەی خۆیـــــــدا دەگەڕایەوە، بەڵام دوای ئەوە دەبوو دەسبەجێ بکەوێتە شوێن دۆزینەوەی ئیش و ژیانی تایبەتی خۆی دەسـت پـێ بکـا. خـانوو و زەویـــیەکە دەبێـــتە هـــی میکوێـــل بە هەمـــان ئەو شـــێوەیەی بـــاوکی، خـــانوو و بـــاخچەکەی لە باپیرییەوە بۆ مـابۆوە. چیـدی شـەوانی وەک ئەم شـەوانە نـایەنەوە. لە فیکـرەوە چـوو، دەشـێت

خەڵکانێک هەبن، دڵیان بەو جۆرە گۆڕانکارییانە خۆش بێت، وەک پەرۆشیی بۆ شەوی زاوایەتی، بۆ هەموو شتێکی تازە، بۆ جیابوونەوە، بۆ گواستنەوە بۆ ماڵێکی تازە و بۆ بڕیاری گەورە. هەبێ و نەبێ کاتی خۆی دایکی، لە گوندەکەی ئەوبەری چیا، شەو ڕاکشاوە و زانیویەتی ئەوە دوایین شەوێتی لەوێ، دەبێ باوکی یەک لەدوای یەک براکانی بینیون، کە ڕۆیشتوون و ماڵیان جێهێشتوون. میکوێل دەیزانی ئەم خۆی ئەو گۆڕانکارییانەی پێ خۆش نییە، میکوێل حەزی دەکرد هەموو شتێک وەک خۆی بێت. کاتێک بیری لەو شتانە دەکردەوە و لە دەرەنجامەکانیان ڕادەما، ئیدی جوردی خەو بردبوویەوە. میکوێل لە بەرامبەریدا ڕوخسارە سپییە پاقیژەکەی و قژە ڕەشەکەی دەبینی کە تا نزیک پێستە سەری تاشرابوو، گوێی لە هەناسەدانە هێمنەکەی ڕادێرا، بە شێوەیەک، کە تا ڕادەیەک حەزی دەکرد

دەستی لێ بدات، نزیکی بێتەوە و بۆ ساتێک بە سۆزەوە دەست بنێتە سەر ڕوخساری.

ڕۆژی دواتر دایک هەموو ڕۆژەکە بە ئامادەکردنی فراوینێکی گەورەوە بۆیان سەرقاڵ بوو، کەروێشک و گێزەر و پیازی بە ترش و خوێ تامدراو، کە جوردی حەزی لێ دەکرد بۆ پێشژەم، بۆ لێنان و قازی بە فڕن برژاویش بۆ ژەمی سەرەکیی. میکوێل دەچووە موبەق و دەهاتە دەرەوە، بە لای دایکیدا تێدەپەڕی کاتێ خەریکی ئامادەکردنی ژەمەکان بوو، چاوی دەگێڕا بەشکم بتوانێت بوتڵێک لە پاڵ قوڵکەی چێشتلێناکە یان پەرداخێک شەراب یاخود کۆنیاک لە نزیکییەوە ببینێت، بەڵام هیچی بەرچاو نەکەوت.

ئەو ئێوارەیە دایک سفرەیەکی سپی بەسەر مێزە کۆنە جوانەکەدا ڕاخست و بە جۆرێک خوانەکەی ڕازاندەوە وەک ئەوەی براکەی و دشەکەی لە گوندی پالووسا — ی بەری ئەوبەری

چیاوه بۆ سەردانیان بێن، یاخود یەکێک لە شووبراکانی لە لێریدا - وە هاتبێ. ئێوارەیەکی درەنگ میکوێل تێبینی کرد بوتڵێک شەرابی سپی هەڵپچڕاوە، پێیوابوو دایکی بۆ چێشتلێنانەکە پێویستی پێی بووە، بەڵام ئێستا کە بە دوایدا گەڕا، بینی دیار نەماوە.

دایک پرچی شانە کرد و جلکی پاکی پۆشی، باوکیش چاکەت و پانتۆڵ و کراسێکی سپی لەبەرکرد. میکوێل وای بە خەیاڵدا هات ڕەوشەکە سادەتر دەبوو ئەگەر یەک دوانێک لە هاوسێکان سەرێکیان کێشابایە ژووریێ یاخود فەرموو کرابان نانیان لەگەڵ بخۆن. بەڵام لە ماوەی ساڵاندا شتی ئێجگار زۆر لە گوند ڕوویاندابوو، کە نەدەکرا ئەو خەیاڵەی میکوێل بە ڕاست بگەڕێ. گەرچی هەموو هاوسێکان دەیانزانی چ ڕۆژێک جوردی سەفەر دەکا، کەچی کەسیان خۆیان لێ بە خاوەن نەدەکرد، ئەوە بەهۆی ئەو قورپوقەپییە قورسەوە

بــوو، کە دوای شەڕەقســـە لەنێـــوان بـــاوکی و هاوسێکانیاندا لەسەر ئـاو، بـاڵی کێشـابوو. دەبـوو ئەمان بە تەنها نان بخۆن.

میکوێل لەم جۆرە ئێـوارانەدا بـاوک و دایکـی گەنج دەبینین: باوک بە مشور و شادمان دەینواند کـاتێ مۆمەکـانی دادەگیرسـاند و خـواردنی دابەش دەکرد و شەرابی تێ دەکرد، دایک هەستی دەکـرد ئازادە قسان لەبارەی دایکیی و ئەو چێشتەوە، کە لە بـۆنە جیاوازەکانـدا لێـی دەنـێ و هەمـوو ئەو شـتانەی کە لەبـارەی چێشـتەکەیەوە دەگـوترێن و لەبـارەی ئاهەنگەکـانی کـۆنە گونـد و هاوسـێکانی ئەوێیانەوە، بکـات. دایـک هەمـوو ئەو قسـانەی بە تەرزێکـی خۆپـارێزانە دەوتـن، بەبـێ ئەوەی هـیچ ئامـاژەیەکی ڕەخنەگـرانە بەو ژیـانە بـدا، کە لێـرە دەژیا، ژیانێک کە حەزیـان دەکـرد لە هەر چەشـنە ژیانێکی تری ڕابردوویان، خۆیانی لێ بدزنەوە.



بەیانییەکیــان دوای ڕۆیشــتنی جــوردی بــۆ سـەربازیی، میکوێـل بە پێدزکێ بـۆ مـوبەق هـاتە خوارەوە و بەسەر دایکیدا هـات قـوومی قـووڵی لە پەرداخێــک دەدا. دایـک دەسـبەجێ پەرداخەکەی دانا. میکوێـل هەوڵـی دا نزیکـی بێـتەوە تـا بزانـێ ئاخۆ هەناسەی بـۆنی چیـی لـێ دێ، بەڵام وا پـێ دەچوو ئەو بە ئەنقەست خۆی لـێ دوور بخـاتەوە، بە پەلە بەرەو لای کـولانەی کەروێشـک و پاشـان مریشـکەکان ڕۆیشـت و دیـار نەمـا. هەر کە چـووە دەرەوە، میکوێـــــل پەرداخەکەی دۆزیـــــیەوە. پەرداخەکە بەتـاڵ بـوو، بەڵام ئەو بـۆنەی تیایـدا

مابۆوە، بۆنی شەرابێکی قورس بوو، ئەو بۆنەی میکوێل ئەو بەیانییە چوو بە کەپوویدا، بۆنێکی تاڵ و تا ڕادەیەک ناخۆش بوو. پەرداخەکەی لە هەمان شوێنەکەی خۆیدا دانایەوە تا نەبا دایک کتوپڕ خۆی بکاتەوە بە ژووردا.

دایک لە ڕۆژانی یەکەمی ڕۆیشتی جوردی دا، دەستی نەچووە نوێنەکەیەوە. تەنها بیجامە قەدکراوەکەی ژێر باڵشتەکەی لێ نەمابوو. کاتێ میکوێل شەوانە دەچووە ژووری نووستن، دڵتەنگی دایدەگرت، بۆیە دایک بەرگەدۆشەک و باڵشت و متیل و بەتانییەکانی هەڵگرتن. ڕۆژەکانی ئەووەڵین میکوێل توانی وا بنوێنێ جوردی دوورنەکەوتۆتەوە، وایدەنواند شەوانە گوێی لە دەنگی هەناسەدانییەتی، بەیانییەکیان کاتێ یەکەمین دەنگەکانی بەیان هاتنە گوێی، بە سەریدا هات تەماشای تەختەخەوی براکەی بکات، تا بزانێ ئاخۆ هێشتا وەئاگا نەهاتۆتەوە.

لەبەرئەوەی هەوا هێشتا هیشک و هەتاو تینی تێدابوو، باوک پێیوابوو دەبێ لە ئیشەکانیان بەردەوام بن و دیوارێکی پشتیرەکە چاک بکەنەوە، ئیشێک کە باوک گوتەنی قەت قەت تەواویان نەدەکرد، بەڵکو هەر دەخرا بە قونا تا دواجار دیواری پشتیرەکان دادەڕمان و مەڕەکان بە دەرەوە دەبوون و بە درێژایی شەوان لەبەر سەرمادا دەمانەوە. کاستێلێتی هاوسێیانی بە نموونە هێنایەوە، کە بە تەمبەڵیی و تەوەزەلییەکەی ناسرابوو. وتی گەر خزمەتی پشتیرەکان نەکەین ئەوا عاقیبەتمان وەک کاستێلێت دەبێت. وا پێ دەچوو تەنها گۆکردنی ناوی کاستێلێت، باوک خەنی بکا و زەردەخەنەیەکی ئارامانەی بخاتە سەر لێو کە میکویل زۆر پێی ئاشنابوو.

ئیشەکە زەحمەت بوو، دەبوو بەردی قورس لاببرێن و هی تریان بخرێتە شوێن و کۆڵەگە بۆ

پتەوکـردن ڕایەڵ بـکەن و تـوێژەبەردی سـاپیتە دابگرن. باوک کە جاران وەک وەستای بەرد ئیشی کردبوو، بەردەکانی دەتاشین و دەیکردنە بەردی نـوێ. ئەو بەردانەی لە خـاوەن پشـتیرێکی داڕووخـاوی گونـدێکی ئەو نزیکـانەی دەکـڕین و بە شەڕەشـەق دەیگواسـتنەوە مـاڵەوە. وردە وردە ڕوونبـۆوە بـاوک دەیەوێـت لایەکـی پشـتیرەکە بڕووخێنێ، خشتی هەرزان لە نـاوەوە و بەردی لە دەرەوە تێدا بەکاربهێنێ. میکوێل ئەو کەسـە بـوو، کە دەبـوو بەرد هەڵگـرێ و بەرد بهێنـێ، هاوکـات باوک جێگەیەکی لەبەر هەتاودا بۆ خۆی دۆزیبـۆوە و لەوێدا دەیتوانی ئەسکەنەسازیی بکـا و بقـاڵبێنێ و بنکەشـی بکـات. هەمـوو جارێـک کە میکوێـل بە عارەبـانەیەکی دوو دەسـتکەی پـڕەوە بەلایـدا تێـدەپەڕی، یـاخود بە کـۆمەڵە بەردێکـی نوێـوە دەهات بۆ لای، باوک شتێکی هەبـوو پێـی بڵـێ — شتێک لەبارەی خوونەریتی هاوسێکانەوە، لەبارەی

چۆنایەتی نزمی خشتەکانەوە، لەبارەی خۆگریی بەردەوە، لەبارەی کورتی ماوەی لەدایکبوونی کارژۆڵە و لەبارەی ئەوەوە ئاخۆ دەبێ دایک ئێستا چ چێشتێکی بۆ لێ نابن یاخود دەبێ جوردی کەوتبێتە کوێوە و بڵێی بەو زووانە هەواڵی بگات.

دوای سەعات دووی پاشنیوەڕۆ کاتێ خۆر لەودیو گردۆڵکەکانەوە دیار نەما، هەوا زۆر ساردی کرد و هەست دەکرا سەرەڕای ئەوەی ڕۆژەکەی هەتاو بوو، کەچی ئەوان لە چلەی زستاندان. میکوێل هەوڵی دا باوکی قاییل بکا لە دوای فراوین، ئیش نەکەن و لەبری ئەوە خەریکی ئاژەڵەکان و خۆراکدانیان بن، کەچی باوک سوور بوو لەسەر ئەوەی هەموو ڕۆژێک سەعاتێک زیادە ئیش بکەن. بەڵام کاتێ دەکەوتنەوە ئیش، بە دەگمەن بڕیان دەکرد، باوک سەری دەلەقاند، زەردەخەنەی دەهاتێ کاتێ میکوێل لەبەردەمیدا

ڕادەوەستا و دەیوت ئیتر با دەست هەڵبگرن و ئەوە دوا بەردی ئەو ڕۆژەی بێ.

لە یەکێک لەو ڕۆژانەدا، کاتێ پاش نیوەڕۆ میکوێل زووتر لە وادەی خۆی بۆ ماڵەوە گەڕایەوە، دایکی بینی لە لای مێزەکەوە دانیشتووە. کاتێ میکوێل خۆی بە ژووردا کرد، دایک سەری هەڵنەبڕی. بە گشتیی دایک بەیانیان لە خەو هەڵدەستا و کوپێک چوکلادی گەرمی دەخواردەوە، بەڵام میکوێل زانی دایک نیوەڕۆخەوی کردووە و تازەکی لە خەو هەستاوە. دایکی زۆرترین شت حەزی لەوە بووە بە درێژایی ڕۆژ بجوولێ، چێشت لێ بنێ، شت بشوا و بە مریشک و کەروێشک و قازەکانیدا ڕابگات. میکوێل یەکەمجار وای نواند دایکی نەبینیوە، پەرداخێک ئاوی لە بەلوعەکە خواردەوە، بەڵام کاتێ لای کردەوە، دایکی بینی دەستەوئەژنۆ دانیشتووە و خۆی ڕادەژەنێ. کاتێ لێی پرسی چییەتی، ئەو تەماشای نەکرد.

پێی وت: "باوکت بانگ بکەوە".

کە میکوێـل لەگەڵ باوکیـدا گەڕایەوە، هێشـتا دایک هەر خۆی ڕادەژەند، وەک ئەوەی ئەوە تـاقە شـتێک بـێ، ئـازارەکەی هەرچییـەک بـێ، هێـور بکاتەوە. ئەمجارەش سەری هەڵنەبڕی.

باوک پرسی: "چی بووە؟".

- خۆت دەزانی چی بووە.

دایـک وایـوت و کـاتێ بـاوک خـۆی بەرەو لای دانەواند، ڕووی لێ وەرگەڕاند.

دایک پرسی: "هەردووکتان بوون، یان بە تەنها هەر خۆت؟".

باوک وتی: "تەنها هەر خۆم".

میکوێل وتی: "بۆ چیت کردووە؟".

دایـــک وتـــی: " ئەو چەلەنـــگە شـــەرابانەی ڕشتوون، کە مـاوەیەک لەوەوبەر بە ڕاسپاردەگەدا گەییشتبوون".

میکوێل وتی: "من هیچ شەرابێکم نەبینیوە".

باوک وتی: "کوڕە هەر بە ناو شەراب بوو. شتێکی ترشاو بوو. تۆ نەتبینیوە لەبەرئەوەی شاردبوونییەوە. من هەر هەموو بەزمەکەم لە نهۆمی سەرەوەی گەورەکەوە بەو دووربینە بینی کە تۆ لە سەربازییەوە هێناوتەتەوە. گوایە زەیتیان بۆ هێناوین، بەڵام ئەوە هەر تەنها فێڵ بوو".

دایکی وتی: "سیخوڕییم بەسەرەوە دەکەیت".

میکوێل لە باوکی پرسی:" ئەی دوایی؟"

باوک وتی: "کاتێ ئەوان ڕۆیشتن، چوومە خوارەوە و هەموویم ڕشت. هەر هەمووی. چەلەنگەکانیشم لە شوێنی خۆیان دانانەوە، بەڵام ئێستا ئیدی ژەهریان تێدا نییە".

دایک وتی: "تۆ لە ژەهردا شارەزایی باشت هەیە".

میکوێل سەریسوڕما چۆن لەناکاوێکڕا دایکی چاوی پەڕییە پشتی سەری. تووڕەبوونەکەی هەر لەوەدا نەبوو.

باوک وتی: "ئاخر گوناهم چییه دەبێ من له تەنیشتتەوە بنووم. که دەنوویت ئەو شەرابە خۆماڵییە بۆگەنی دێت".

دایک بەردەوام بوو له ڕاژەنینی خۆی وەک ئەوەی ئەوان لەوێ نەبن. ئەوان نزیک له پاڵیدا ڕاوەستابوون. میکوێل سەرنجی سیمای باوکی دا غەمگین و ساوگەرتی دەینواند و پێیوابوو باوک هەست دەکا شتی زۆر گوتووە و ئیتر دەبێ ئاگای له دەمی بێت.

دایک به ئارامیی وتی: "من پەشیمانم که ڕۆژێک له ڕۆژان یەکێک له ئێوەم ناسیوە". وایوت و تۆنی قسەکردنەکەی ڕوون و بێ ئەملاولا بوو.

باوکی میکوێل سەرسوڕماوانه لێی ڕوانی.

- کاممان؟

- ئا، ئەوەی وتم. گوێت لێ نەبوو؟

- مەبەستت کامانه؟

- مەبەستم ئەوانەیە، که لەم ماڵەدا دەژین.

- کاممــان؟ حەز دەکەیــن بــزانین مەبەســتت کاممانە.

- مەبەستم هەمووتانە، بەڵام بە تایبەتی تۆ.

هەمدیس ئارام دەدوا.

- مەبەستەکەم ڕوونە.

- ئا، کەواتە هـیچ، پێویســت ناکا زۆر لەسـەری بڕۆین. وایە؟

دایــک پرســی: "دەتەوێ حەقــی ئەوەم بــۆ بکەیتەوە کە ڕشتووتە؟".

- نا. نایکەمەوە.

- ئا. کەواتە تەواو.

وای وت و کوڵی گریانی بەربووەوە.

کـاتێ بـاوک لە مـاڵ چـووە دەرەوە، میکوێـل نەیــدەزانی ئــاخۆ بمێنێــتەوە یــان بــڕوا. لە پەنــجەرەکەوە بــاوکی بینــی بەرەو ئەو گەوڕە دەچوو، کە دەستیان پێدا هێنابۆوە. میکویل گوێی لێ بوو دایکـی بەرز و بەرزتـر، هەرچـی زیـاتر بـێ

هەدادان دەگریا. میکوێل چووە تەنیشتی و دەستی خستە سەر شانی. وردە وردە دەستی بەرەو لای دەستی برد، پەنجەیەکی گرت و لەنێو دەستی خۆیدا ڕایگرت، پاشان هەموو دەستی گرت و لەنێو دەستی خۆی نا. ئێستا دایک ئیدی لە گریان ژیر ببۆوە بەڵام هێشتا هەر خۆی ڕادەژەند.



دایک بێ جووڵە و نەیدەویست دەم لە هیچەوە بدات. میکوێل ئاگردانەکەی داگیرساند، پێشنیاری بۆ کرد بێت و لەبەریدا دانیشێت، دایک لێ گەڕا بەرەو ئەوێی ببا و داینیشێنێت وەک ئەوەی نابینا بێت، یاخود هیچ شتێک لە دەستی خۆیدا نەبێت. دایک پێی وادەگرت برسی نییە. پرسیارکردن لەبارەی ئەوەوە ئاخۆ چ شتێکی ناوێت، یان هیچ ناخواتەوە، بە لایەوە وەک ئەوە بوو گاڵتەیەکی ڕەقی لەگەڵ بکرێ. ئیدی میکویل – یش کۆڵی دەدا.

میکویل و باوکی لە لای مێزەکەوە دانیشتن و ئەو شۆربایەیان خوارد، کە لە ڕۆژی پێشوو مابۆوە، پاشان کەمێک هەم* و تەماتەیان بە نانەوە خوارد. ئەوە ئەو فراوینە نەبوو، کە ڕاهاتبوون دەیانخوارد، بەڵام هیچیان لەوبارەیەوە نەوت و هیچ گلەوگازندەیان نەکرد. کاتێ میکویل ویستی بڕوا و لە جێگەکەیدا ڕاکشێ، دوای باوکی کەوت و لەسەر پێپلیکانەکان ڕایگرت و بە چرپە پێشنیاری بۆ کرد سبەی بچن بۆ لا سیۆ و نەختێک شەراب بۆ دایکی بکڕن، شەرابێکی باشتر لەو شەرابەی کۆگەی خواردەمەنییەکە بۆیان هێناوە، دەتوانن ڕاستەوخۆ پێشی بڵێن ئەگەر حەز دەکا ئەوا با خۆیشی لەگەڵیاندا بێت. باوک بەر لەوەی وەڵامی بداتەوە، باسکی خستە سەر شانی:

---

* Skinka گۆشتەنەرمەی سەر ڕانی بەراز.

- نەء، ئەمەیان باشترە. کە تۆیش لێرە نەبوویت هەر ئاوهامان کردووە. ئەو دەبێ بە ئێجگاریی واز لە خـــواردنەوە بهێنـــێ، چەنـــد مانگێـــک لەمەوبەر دۆکتۆر وتی ئەوە تاقە ڕێگەیەکە بۆ ئەوەی وازی لێ بهێنێ، لەبەرئەوەی چ شتێک شک نابات بیخواتەوە. ئەمە باشترین شتە. دوای چەند ڕۆژێک ئاسایی دەبێتەوە.

میکوێل پرسی: "دەمێکە دەخواتەوە؟".

- چەند ساڵێکە.

- ئەی چۆن بەسەرماندا تێپەڕیوە؟

باوک وتی: "هەمووان هەستیان پێ کردووە".

میکوێل وەڵامی دایەوە:" جوردی نا".

باوک وتی: "با، هەڵبەت هەستی پێ کردووە".

کـــاتێ هەمـــدیس چـــووەوە خـــوارەوە، بـــاوک لەگەڵیـــدا هـــات، بینییـــان دایـــک هێشـــتا لەبەر ئاگردانەکەدا دانیشتووە. وەک ئەوەی سەرمای بێ، هەڵدەلەرزی. میکوێل جێیهێشتن و چووە جێگە.

گڵۆپەکەی کوژاندەوە و لەسەر تەختەخەوەکەی ڕاکشا، بە کپی گوێی لێ بوو کەسێک لە نهۆمی خوارەوە دەهات و دەچوو، ئەوەی بیر کەوتەوە، کە لە سەربازی گەڕابۆوە، چۆن جوردی بە شێوەیەکی تایبەتی ڕەفتاری لەگەڵ دەکرد کاتێ لە ژووری نووستنەکە بە تەنیا دەبوون. جاران ئەم و جوردی هەر تەواو سروشتی دەیاننواند کاتێ جلکیان لەبەر چاوی یەکتردا دادەکەند، بەڵام دوای گەڕانەوەی، ئەگەر میکوێل بهاتبایە ژوورەوە، جوردی خۆی دادەپۆشی. یان لە لێواری تەختەخەوەکەدا دادەنیشت و ناڕەحەت دەرپێ کورتەکەی دادەکەند و بیجامەکەی لەبەر دەکرد، هێند شەرمن دەتگوت ژنێک لە ژوورەکەدایە. ماوەیەکی خایاند تا جوردی و باوکی، لەسەر هەبوونی ئەو لە ماڵەکەدا ڕاهاتنەوە، ئەو ڕاستییەیان دەشاردەوە، کە بە بێ ئەو، لە قەرەی ئیشوکارەکان هاتوون. جوردی بێ مەیلانە دەستی

له بەشـــێکی ئیشـــوکارەکانی هەڵگـــرت، کە له ڕاستەقانییدا هـی برا گەورەکەی بـوون. تەنـانەت بـاوک و جـوردی باسـی ئەوەشیان بـۆ نەکـردووه کاتێک ئەو له ماڵەوه دوور بووه، دایکیـان بـووەتە مەشـروبخۆرێکی بـێ وێـنە. لەمیـانەی شـاردنەوەی ئەو نهێنیـیەوە لێـی، وەک غەریبێـک مامەڵەیـان لەگەڵ کردووه.

شەو له ژوورەکەی خوارەوه گوێی له دەنگیـان بوو، باوک هێمن بوو بەڵام دایک به دەنگێکی بەرز دەدوا و هەنسکی دەدا. دواجار چوونه نێو جێگە و بۆ ماوەیەک بێدەنگیی بـاڵی کێشـا، پاشـان گـوێی لێ بوو زەوینی تەختەیی ژوورەکە وەجیرە کەوت و یەکێکیان هەمـدیس هـاتەوە خـوارەوە. دەسبەجێ ئەویتریشـــیان دوای کەوت و دووبـــارە دەنگەکـــان گەیشتنەوە گوێی. میکوێل دەیزانی چیدی نـاتوانێ بنوێ، ئێستاش کە جوردی لەسەر تەختەخەوەکەی تر نەبوو، خەو لێ کەوتن شتێکی زەحـمەت بـوو.

نەبوونی ئەو دەنگەی لای ئەو تەختەخەوەوە دەهات و پێی ڕاهاتبوو، خەوی لێ دەزڕاند، ئێستاش نە پرخە و نە هەناسەدانی ڕیتمیک، نە کەسێک کە بەدەم خەوەوە بکەوێتە سەر کەلەکە، وا پێ دەچوو ئەوە لەو بایە زیاتر بۆژۆی بکا کە ئێستا گڤەگڤ لەو چەند سەعاتەی بەر لە سپێدەدا، لە باکوورەوە ئاراستەی خۆی گۆڕیوە و پەنجەرەکانی هێناوەتە لەرە.

بۆ بەیانی باوکی لە موبەق بینی. مەزەندەی کرد دایکی هێشتا هەر لە جێگەدا بێ. باوک لەبەر ئاوێنە گچکەکەی ژوور قوڵکەی قاپشۆرییەکەدا، هێور و بە دیقەتەوە ڕیشی دەتاشی.

میکوێل پرسی: "ناکرێ بچین بۆ لا سیۆ و ئەو شتەی بۆ تەگبیر بکەین کە دەیەوێ؟".

باوک وەڵامی نەدایەوە.

میکوێل بەرزتر وتی: "ئەوەی بۆ قەرەبوو بکەوە کە ڕشتووتە".

- نەء.

باوک وای وت و نیگای لە ئاوێنەکەدا لە نیگای میکوێلەوە ئالاّ.

- دەبێ درەنگ یان زوو واز لە خواردنەوە بهێنێ. هەمیشە گونجاوترین کاتیش بۆ ئەوە، ئەمڕۆیە. بەهەرحاڵ ئێستا ئەو نوستووە.

هێورتر و بە دیقەت تر دەستی بە ڕیشتاشینەکەی کردەوە، وەک ئەوەی ئەوە بۆ ئەو گرفتێکی زۆر لەوە هەنووکەیی تر بێ لە شتێک، کە کوڕەکەی بیری لێ دەکردەوە. میکوێل کوتە نانێکی دۆزییەوە، پاروویەکی بە نەختێک زەیت و تەماتە و خوێوە پێ کرد و خواردی، پارچە پەنیرێکیشی دۆزییەوە و قاشێکی لێ کردەوە و پەلەپەل خواردی، بەر لەوەی بچێتە دەرەوە و هێلکەکان لە کولانەی مریشکەکان کۆبکاتەوە، قووتی دا. باوکی جێهێشت بەبێ ئەوەی هیچی زیاتری لەگەڵ بڵێ.

کاتێ چووە بەر سێبەرەکە، هەستی کرد دونیا هەر زۆر ساردی کردووە، ئاوی پارچە زەوییە پەرژینکراوەی بەردەم کولانەی مریشەکان تەواو بەستبووی. ئاسمان شین بەڵام هەمان شینە جیاوازە ئارامەکەی جاران نا، زیاتر لەوە دەچوو با، هەوری هەلاجیی کردبێ بۆیە شینایی ئاسمان ئەوەندە ڕووتەڵە و بێ دیفاع بوو. کاتێ بەرەو خوار لە گەورەکانی ڕوانی، باوکی بینی پەناگەیەکی گەرمی بۆ خۆی لەبەر هەتاوەکەدا دۆزیبۆوە. میکوێل بەرەو لای ڕۆیشت و پاشان هێور هێور تاقی ئیشی بەیانیانیان بۆ ڕووپۆشکردنی خشتە نوێیەکانی گەورەکە بە بەرد، تەرخان کرد.

بەر لە فراوین، ڕۆیشتن سەرێک لە مەڕەکان بدەن، ئاڵەفیان لە نهۆمی سەرەوە بۆ گەورەکە داگرتە خوارەوە. نەیاندەزانی ڕێک سەعات چەندە، بەڵام کاتێ لە بەسەرکردنەوەی مەڕەکان بوونەوە، میکوێل سەریسوڕما بوو لەوەی دایکی تا ئێستا بۆ

نانخواردن بانگی نەکردوونەتەوە. پاشان بیری کەوتەوە چی ڕوویداوە و مەزەندەی کرد هێشتا هەر لە جێگەدا، بێ یاخود زۆر لەوە خەفەتبارتر بێت بتوانێ چێشتیان بۆ لێ بنێ.

کاتێ هاتنەوە ماڵەوە، میکوێل بۆی دەرکەوت دایکی نەهاتۆتە موبەق. کەس دەستی لە قاپوقاچەخەکانەوە نەدابوو یان لەسەر یەک داینەگرتبوون. بینی "کلوا" ش خواردنی نەدراوەتێ. باوک بە پێپلیکانەکەدا سەرکەوت و پاشان هاتەوە خوارەوە و وتی دایک لە ژوورەکەی نییە. کاتێ لە یەکەمین گەڕان بە ماڵ و دەوروبەری گەوڕەکان و دەرەوەی ماڵدا بوونەوە، میکوێل وای بۆ چوو دایکی ڕۆیشتبێ و سەری خۆی هەڵگرتبێ. ئاخر ئەگەر ئەمان لێی گەڕابن تەواوی پیشنیوەڕۆ بە تەنیا بێ، یەک تاقە جاریش سەریان لە ماڵ نەدابێتەوە، لانیکەم بۆ خواردنەوەی پەرداخێک ئاو یان بزانن وەزعی ئەو

ژنە چۆنە، ئیتر دیارە ئەوە جۆرە هاندانێک بووە بۆی کە بڕوا و سەری خۆی هەڵبگرێ. فەڕەیەکی تر بە دوایدا گەڕان و ئەمجارەش هیچ سەرەداوێکیان دەست نەکەوت، میکوێل لە فیکرەوە چوو ئاخۆ دایکی بۆ کوێ سەری هەڵگرتبێ و بە چی سەری هەڵگرتبێ. ڕێی تێ ناچێ سەری لە یەکێک لە ماڵە هاوسێکان دابێ، ئاخر هەمووان لە گوندەکەدا سەریان سوور دەمێنێ ئەگەر دایکی لە دەرگەی ماڵەکانیان بدا، ساڵانێک بوو سەردانی هیچ کامیانی نەکردبوو. هیچ پاسێکیش لە گوندەوە نەبوو، تەنانەت لە ڕێگە سەرەکییەکەشەوە، کە دە یازدە کیلۆمەترێک دوور بوو. جاروبار و تاکوتەرا پاس تێدەپەڕین، بەڵام ئەگەر ئەو بە ئاراستەی لا سێو ڕۆیشتبێ، ئەوا هیچکامیان ڕاناوەستن هەڵی بگرن، مەگەر ڕێبوارێک بە لایدا تێپەڕیبێ و ئەوەش شتێکە ناچێتە ئەقڵەوە.

بەهەرحاڵ دایک ڕۆیشتووە و سەری خۆی هەڵگرتووە. کاتێ باوک پێشنیاری کرد ناو گەوڕەکانی بە دوادا بگەڕێن، میکوێل سەری با دا. ئەگەر دایک خۆی لە گەوڕەکاندا شاردبایەتەوە، ئەوا بۆ ئەوەی خۆی بگەیەنێتە گەوڕەکان، هەر دەبوو بە بەردەم ئەماندا تێپەڕێت، مەگەر ئەو ماوە کەمە نەبێت کە ئەمان لای مەڕەکان بوون، تەنانەت بەوەشەوە هەر دەبوو بیانبینیبا. پاڵتۆکەی و لەچکە جوانەکەی و پۆتینەکانی دیار نەبوون. ئەگەرچی میکوێل دووجار ئەو شوێنەی پاڵتۆکەی لێ هەڵواسراو و پۆتینەکانی لێ دانرابوو، پیشانی باوکی دابوو، کەچی ئەو هەمدیس و هەمدیسان بە پێپلیکانەکەدا دەچووە ژێرزەمینەکەی دەرەوە، دەچووە ئەمبار و گەوڕەکەی خوارەوە. میکوێل لای مێزەکەوە دانیشت و لێ گەڕا باوکی چەندی پێ خۆشە بۆ خۆی بگەڕێ، درەنگ یان زوو هەر دەبێ کۆڵ بدا و

دانیشێ و تەگبیری ئەوەی لەگەڵ بکا، ئاخۆ دەبێ چی بکەن و چی نەکەن.

هێشتا دە دوانزە ماڵێک لە گوندەکەدا هەبوون، سەرنجی هەر هەموو شتێکیان دەدا، کە لە گوند ڕوویدەدا، پیرەکان لەبەر پەنجەرەکاندا دادەنیشتن و دەیانڕوانی، ئەو گەنجە کەمانەی لە گوندەکەدا مابوون، لە لەوەڕگە یاخود لە پشتیرەکاندا دەبوون، ژنان خەریکی ئیشوکاری خۆیان و چاوێکیشیان لەسەر کەشوهەوا بوو. چ منالێک لە هیچکام لە ماڵەکاندا نەبوون، زوربەی گەنجەکان بۆ شارەکان، یان گوندە گەورەترەکان گواستبوویانەوە. میکوێل و جوردی تاقە دوو گەنج بوون لە گوند مابوونەوە. ئەمان وا ڕاهێنرابوون بە کەسی ترەوە پەیوەست نەبن، بەڵام لەو ساڵانەی دواییدا، کە دوژمنایەتی نێوان باوک و ئەودوای خەڵکی گوندەکە هێند تاوی سەند، ئیتر هەر جۆرە پەیوەندییەکیان لەنێواندا پچڕابوو. باوک شکایەتی

لە سێ خێزان کردبوو لەبەرئەوەی لە مانگەکانی هاویندا ئاویان بۆ بەرژەوەندی خۆیان بردبوو. باوک ڕۆیشتبوو بۆ ترێمپ و شایەتی لە دژیان دابوو، خێزانەکانی تریش، گەرچی ئاویان دزرابوو، کەچی لە دادگا بەرگرییان لێ کردبوون. دادوەرەکە بە غەرامە کێشەکەی بڕاندبۆوە. ڕقوکینەی ئەو ماڵانە بەرامبەر باوکی میکوێل کە شیکایەتەکەی کردبوو و ناچاری غەرامەدان کرابوون، هەمیشە بەتینوتاو بوو. ئەگەر باوک بیتوانیبایە قەناعەت بە یەکێک لە کوڕەکان بهێنێ کە گوێ بگرن، ئەوا ناوی هاوسێکانی بە دز و درۆزن دەهێنا، هاوسێکانیش لای خۆیانەوە هەموو ڕۆژێک بە لایدا ڕەت دەبوون و مەرحەبایەکیشان لێ نەدەکرد.

ئێستا ئیدی لەگەڵ میکوێلدا ناچاربوون لە دەرگەی ماڵ بە ماڵیان بدەن، گەڕانیشیان بە دوای دایکدا ددانپیانانێکە بەوەدا کە هیچ شت لە ماڵەکەیاندا لە جێی خۆیدا نییە. میکوێل تەواو

دڵنیا نەبوو کە ئاخۆ هاوسێکیان پێیان دەڵێن چییان بینیوە و نەبینوە. بەڵام چاریان ناچار بوو، ئەوە تاقە شتێک بوو کە دەیانتوانی پەنای بۆ بەرن. ئەوسا کاتێ باوک کۆڵی لە گەڕان دا، پاڵتۆکانیان لەبەرکرد و بە ڕێ کەوتن، هەڵبەت پێیان باش بوو لە نزیکترین هاوسێیانەوە دەست پێ بکەن تا کەس وا مەزەندە نەکا کە چەند هاوڕێیەکی تایبەتییان هەن، یاخود کەسێکیان لە کەسانی تری گوندەکە، لەوانی تر پێ باشترە.

ماتیۆ کاسا ڕاول، خاووخلیچک و بە ورگە زلەکەیەوە بەرەو دەرگەی حەوشە هات. ئەو یەکێک لە غەرامەکراوەکان بوو. هەر کە باوکی میکوێل زاری هەڵێنایەوە، ماتیۆ ناحەزانە و بە نیوەچاوێکی هەڵهاتووەوە پیایدا ڕوانی، هیچ ئاماژەیەکی پیشان نەدا کە لە قسەکانی حاڵی بووە، لەبری ئەوە سەرنجی ڕوخساری دەدان، دەرفەتێکی باشی بە خۆیدا، کە تێیدا بیر بکاتەوە

ئاخۆ چی بینیوه و چی نەبینیوه. میکوێل هەر لە سەرەتاوە لە دڵی چەسپی بوو کە ماتیۆ دایکی بینیبێت، یان نەیبینیبێت هیچ یارمەتییەکیان نادات، بۆیە بە لایەوە باشتر بوو هەرچی زووە لەبەر دەرگەکەی دووربکەونەوە. میکوێل باوکی پاڵنا و سەری بەرەو لای ماڵەکەی دوایی لەقاند، بەڵام باوک لە جێگەی خۆی نەجووڵا، ڕووە و ڕووپشتی دەرگەکە دانەوییەوە، چاوەڕێی شتێکی دەکرد، نە پرسیارەکەی دووبارە کردەوە و نە هیچ شتێکی تریشی گوت، هاوکاتیش ماتیۆ قوڕگی پاک دەکردەوە. ماڵەکەی ماتیۆ نزیکترین ماڵ بوو لێیانەوە، میکوێل بیری کردەوە لەوانەیە ماتیۆ هەموو ڕۆژەکە پێی نەنابێتە ئەودیو دەرگەی ماڵەکەیەوە، ئاخر ئەو لە پەنجەرەیەکەوە، جوان جوان دەرەوە دەبینێ و دەبێ هەر زۆر هاسانیش دایکی ئەمی بینیبێ، کە کام ڕێگەی گرتووەتەبەر.

هاوکات کە لە ناو دەرگەکەدا ڕاوەستابوون، لە ناکاوڕا ئاسمان ڕەش داگەڕا، هەورێکی ڕەشی شینباو بە ژوور سەریانەوە پەیدا بوو و بووە بارستەیەکی چڕ و نزم. ڕووناکی بە سوورێکی تاریک گۆڕا و با کە خستی. میکوێل ڕاچڵەکی. سوور دەیزانی کە ئەوە واتە بەفر، واتە یەکەمین بەفری ساڵ، بەفرێک کە بارینی زۆر دواکەوتووە و دەکرێ ڕێکەوتی بارینیشی لە ڕۆژێکی وەک ئەمڕۆ سارددا، دۆخەکە دژوارتر بکات.

ماتیۆ وتی: "هەڵبەت بینیم کە ڕۆیشت، بەڵام نەمبینیوە بگەڕێتەوە".

باوک بە تێفکرینەوە وتی: "بە کام ئاراستەدا ڕۆیشت؟".

- بە ئاراستەی "کول دێل سو" دا.

باوک وتی: "بەڵام ئەو ڕێگەیە ناچێتەوە هیچ کوێ".

ماتیۆ سەری لەقاند.

میکوێل دەسبەجێ خەیاڵی بۆ ئەوە چوو، کە ئەو ڕێگەیە دەچێتەوە سەر "پالووسا"، کە خاڵی لەوێ هێشتا لە خانووە کۆنەکەی باوکیاندا دەژی و تا ئەوێ چوار تا پێنج سەعات ڕێگەیە.

باوک پرسی: "چەندێک دەبێ ئەوت بینیوە؟".

ماتیۆ وتی: "چەند سەعاتێک لەمەوبەر".

- چیی؟ سێ یان چوار؟

- ئا، سێ یان چوار یاخود شتێک لەو بەینەدا.

هەنووکە بەفر هێور هێور تێی دەکرد و ئاسمانیش تاریک و تاریکتر دەبوو. کلووە بەفرەکان گەورە بوون، کاتێ میکوێل دەستی ڕایەڵ کرد تا هەست بە بەفرەکە بکات، دەسبەجێ لە لەسەر بەری دەستی نەدەتوایەوە. بیری کردەوە جێبەکە دەتوانێ بەو ڕێگە باریکەدا بئاژوێ کە دەچێتەوە سەر کڵێسا گچکەکەی لای سانتا مەگدالیناوە و دەشێ نەختێکی تریش بە ڕێگە سەربازییەکەدا بەرەو کول دێل سو، بڕ بکا، بەڵام

لەوێــوە، دەبــێ دایکــی بەو شــڤەڕێ و ڕێــگە ناخۆشانەدا بەرەو پالووسا شۆڕبووبێتەوە، کە هیچ جێبێک ناتوانێ پیایاندا بڕوات و چ ئاوەدانییەکیش لەو ناوانەدا نییە. دوای سێ یان چوار سەعات بە پــێ ڕۆیشــتن، دەکــرێ دایــک هێشــتا لە ڕێــگە ســەربازییەکە بێــت، بەڵام ئەوە شــتێکە نــاچێتە ئەقــڵەوە. ئەوەی زیــاتر ڕێــی تێــدەچێ ئەوەیە گەییشتبێتە کول دێل سو و پاشان هەر بە ڕاستی خۆی دابێتە دەست شڤەڕێکان، میکوێـل پێیوابـوو ئەوان دەبــێ دەســبەجێ جێــبەکە بــخەنە ئــیش و چەندێک بکرێ خێرا بە ڕێگە پێچاوپێچەکەدا بەرەو بەرزاییەکان و ئەو شوێنەی کە هاوینـان مەڕەکـانی بۆ دەبەن بئاژوون، جێگەیەک کە زسـتانان کەسـی پێوە نییە.

کاتێ لە ماڵەکەی دوور کەوتنەوە، ماتیۆ وتـی: "بەم بەفرە ناتوانن زۆر بڕۆن".

میکوێل هاواری لێ کرد: "دڵنیایت ئەو ڕێگەیەی گرتۆتە بەر؟"

- لەوانی تریش بپرسە، ئێمە هەموومان بینیویانە.

بە پەلە گەڕانەوە ماڵ. کاتێک باوک جێبەکەی پێچ پێ کردەوە، میکوێل بە ڕاکردن چووە ماڵەوە تا دووربینەکە بهێنێت.

باوک پرسی: "ئەمەت بۆ چییە؟"

میکوێل سەری بۆ سەر ئەژنۆی داگرت، کە دووربینەکەی لەسەر بوو، وتی:" نازانم... بیرم کردەوە کە...".

باوک وتی: "کاتمان بۆ بیرکردنەوە نییە".

بیریان لە ڕێگە باریکەکەی دەرەوەی گوند دەکردەوە، فلچەی جامی جێبەکە بەوپەڕی خێرایی دەجوولا کەچی لەبەر ئەو بەفرەی لەبەر ڕووناکیی لایتی جێبەکەدا خولی دەخوارد، بە زەحمەت بەردەمی خۆیان دەیبینی. تەنانەت ئەگەر دایک بە

ڕێگەکەدا بەرەو ڕوویان بهاتبایە و تەنانەت دەستی بەرەو ڕوویـان هەڵبڕیبـا، ئینجـا نەشـیاندەبینی. میکوێـــل دەیزانـــی دەبـــێ بە لای بـــاوکییەوە هەوڵەکەیان ئاسنی سارد کوتان بێ. پێیوابوو تاقە شتێک ئومێدیان لەسەر هەڵچنیبێ، ئەوە بوو دایک دوای ئەو کاتە ڕۆیشتبێ کە ماتیۆ وتی. بۆ ساتێک ئەو ئەگەرەی شـەنوکەو کـرد و پاشـان لەوەی کە ڕەنـــگە دایـــک خـــاوتر ڕۆیشـــتبێ، یـــاخود لە چرکەساتێکدا گەڕابێتەوە، پاشان ئەگەرێکی تریشی مشتوماڵ کرد بەوەی دایک لەوانەیە خێرا و زووتـر لەو کاتە کەوتبێتە ڕێ کە ماتیۆ وتـی و ئێسـتا لە ســـنووری پالۆســـادا بێـــت و گورجوگـــۆڵ بە شـــڤەڕێکاندا بەرەو خـــوار بـــووبێتەوە، هێـــواش و خۆپـــارێز ڕۆیشـــتبێ، هەنگـــاو بە هەنگـــاوی خـــۆی هەڵسەنگاندبێ. میکوێل بیـری کـردەوە ئەوە تـاقە شتێکە دایک دەتوانێ بیکا و هاوکات شتێکیش بوو نەدەچووە ئەقڵەوە. میکوێل خەمی ئەوەی بوو کە

دایـک چ هەڵەیەک بکـات. بەڵام دڵنیـا نەبـوو کە نایکات. لەوانەیە ڕێگەی خوار نشێوەکان ئێستا بە بەفر شاردرابنەوە و هەر هەنگاونانێک بەو ڕێگەیەدا شتێکی فریودەرانە بێت.

بـــاوک تەقەلای دەدا، کە جێـــبەکە دەخـــزا بیهێنێـتەوە سـەر ڕێـگەکە. تەنـانەت کـاتێ بەفـر کرێـوەی دەکـرد و بەسـەر جـامی جێـبەکەدا تێـی دەکرد، دەیانبینی بە کلووی گەورە گەورە دەبـاری و لە ڕێـگەکەی بەردەمیانـدا دەنیشـت بە جۆرێـک دوای مـاوەیەک بەنێـو ڕووبەری بە بەفرێکـی چـڕ پۆشراودا جێبەکەیان دەئاژوو کە تا دەهـات زیـاتر لەســـەر یەک کەڵەکە دەبـــوو. هەر زوو لێیـــان ئاشـکرابوو دەبـێ جێـبەکە ڕابگـرن ئەگینـا ڕێـگەی گەڕانەوەیان لێ دەگیرێ.

میکوێـل دەیزانــی گرینگتــرین شــت ئەوەیە بە باوکی بڵێ ڕاوەستن و بگەڕێنەوە، پێی بڵێ ڕەنگە سەفەرەکەیان ئاسنی سارد کووتان بێ و تەنـانەت

مەترسیداریش بێ، بەڵام ئەوەشی دەزانی ئەگەر بگەڕێنەوە و بچنەوە ماڵەوە، ئەوا بەبێ ئەوەی کەمترین زانیارییان لەبارەی ئەوەی کە ئاخۆ دایک لە کوێ بێ، چنگ کەوتبێ. چۆڵەوانیی تاقە شتێکە، کە لەو شەوە درێژەی چاوەڕوانییدا پێشوازییان لێ دەکا.

هەر کە کەمەکێک مەودای پێچ کردنەوە پەیدا بوو، باوک بەبێ ئەوەی هیچ بڵێ، هەوڵی دا جێبەکە پێچ پێ بکاتەوە، میکوێل پێیوابوو باوک بە ئاشکرا بڕوای وایە بەفرەکە لەسەر ئەرزێکی تەخت باریوە. بەڵام تەنها چاڵێکی قووڵی نێوان ڕێگەکە و نشێوەکەی داپۆشی بوو، لەوێدا تایەیەکی پێشەوەی جێبەکە ڕۆچووە ناو چاڵەکەوە. باوک جنێوی دەدا و میکوێلیش لە جێبەکە خۆی هەڵدایە خوارەوە تا بزانێ ئاخۆ دەتوانێ ماشێنەکە لەو چاڵە دەربهێنێ. بینی تایەکە بێهوودە وەک جاڵجاڵۆکەیەک کە کەوتبێتە

ناو ئـاوەوە، دەخـولایەوە. دواجـار ناچاربوون هەر بەردێـک کە لەو نـاوەدا دەیـانبینی کـۆبکەنەوە و تەختەدارێکی کورتیان لە دوای جێبەکە هێنـا و لە بن تایەکەدا دایاننا، بەفر بە شەوارەی خستبوون و بە دەوری جێبەکەدا ڕاکەڕاکیان بوو. کاتێ میکوێل ئاوڕی دایەوە تا خۆی لەو کرێوەی بەفرە بپارێزێ، سـەرنجی دا بەفـر بە هەمـوو ئاراسـتەیەکدا خـول دەخوا وەک ئەوەی باکان پێشبڕکێ لەگەڵ یەکدیدا بکەن. کە پاڵپشـتییەک بـۆ تـایەکە دروسـت بـوو، هەوڵیاندا هەڵیبڕن و بیهێنـنە سـەر ڕێـگەکە، بەڵام تایەکە لە بەفرەکەدا گیری کردبوو و زەحمەت بوو بجووڵێ. میکوێل مەزەندەی کرد نیو سەعاتێک بە پێی پیادە لە گونـدەوە دوورن، لەوانەیە زیـاتریش لە بەفردا، هاوکات کە باوک وەک دوایین هەوڵ بـۆ دەرهێنانی جێبەکە، سلفی لێ دا، میکوێـل هێنـایە بەرچاوی خـۆی، ئێسـتا دایکـی کە لەو کەشـوهەوا سـەختەدا، گیـانی بە سـاخیی بەدەر بـردووە، بە

پارێزەوە لە دەرگەی ماڵی براکەی، ماڵێک کە تێیدا لە دایک بووە، دەدا. لەو ماڵەدا خۆشیان دەوێ و فەرمووی لێ دەکەن و بۆ بەیانییش بە هەر چەشنێک بووە پەیام دەنێرن کە ساخ و سەلامەتە.

جارێکی تریش ترومێلەکەی بەرز کردەوە لەکاتێکدا باوک لەپڕ پێی بە بەنزیندا نایەوە. جێبەکە بە لادا جوولا، ئێستا هەر چوار تایەکەی لەسەر ڕێگەکە بوون، بەڵام ئەوان هێشتا لە گوندەوە دوور بوون. باوک هاواری لێ کرد سوار بێ، نیازی بوو هەوڵ بدا هەمدیس پێچ بە جێبەکە بکاتەوە. خستییە سەر بۆش و لێ گەڕا لەسەرخۆ چەندێک بتوانێ بەبێ مەترسی بۆ پێشەوە بجووڵێ و پاشان برێکەکەی ڕاکێشا و گێڕەکەی خستە سەر بەگ، ئینجا برێکەکەی بەردا و جێبەکە وردە وردە خێرایی وەرگرت. یەکەمجار نەبزووا، پاشان تایەی دواوە لە بەفرەکەدا کەوتە سووڕانەوە، ئیدی

باوک توند پێی بە بەنزینندا نا بە شێوەیەک، کە جێبەکە گەڕایەوە دوا و بۆ سەر ڕێگەکە خلیسکا. ئێستا تا ڕادەیەک بە دروستی پێچیان بە ئاراستەی گوند کردبۆوە، دەیانتوانی بگەڕێنەوە و بە تەقەلاوە دڕ بدەنە بەفرەلووکەی سەر ڕێگە و کرێوەی بەفر بە کلووی گەورەوە، کە پەیتا پەیتا لەسەر جامی پێشەوەی جێبەکە دەنیشت گەرچی فلچەکان بەوپەڕی خێرایی دەجوولان.

لە ماڵەوە بیریان لە هەموو ئەگەرەکان کردەوە، دەبێ دایک چەندێک خێرا ڕۆیشتبێ، دەبێ سەعات چەند ڕۆیشتبێ، دەبێ چەندی پێ بچێ ڕێگەکە ببڕێ بەرلەوەی ناچاربێ شڤەڕێ کۆنەکان بدۆزێتەوە کە بەرەو پالووسا بەرەو خوار دەبوونەوە. ئەوێ تەنانەت هاوینانیش گوزەرگە و شوێنی هەڵەتی وای لێن، کە بنیادەم ناتوانێ پیایاندا ڕەت بێ، بەڵکو دەبێ بە قونەخشکێ لێیانەوە بێتە خوارەوە. میکوێل وتی ڕێی تێدەچێ

کاتێ بەفرەکە کەوتۆتە بارین، دایک گەڕابێتەوە، زانیویەتی زریانێکی ئاوهای بەفر چەند خەتەرە، تەنانەت ئەگەر کاتێ بەفرەکە تێی کردووە، لە پالووسا — وە نزیکیش بووبێ، دەکرێ ئەوەی بە بیردا هاتبێ کە ڕۆیشتن بە ئەرزێکی تەختدا کەمخەتەرترە وەک لە سەرکەوتن بە هەورازدا، تەنانەت ئەگەر چەند سەعاتێکیش بە بەفردا بڕوا، هەڵبەت شتێکی ئاقڵانەترە کە هەر ئاوها بکات.

میکوێل وتی: "گەر بۆ لاسیو بڕۆین ئەوسا دەتوانین لەوێ داوا لە پۆلیس بکەین بزانن ئاخۆ گەییشتووەتە پالووسا. دەتوانین خەبەری بزر بوونیشی بدەین".

باوک سەری لەقاند.

وتی: "من دەزانم هێشتا لە جێگەیەکە و لە ژیاندا ماوە".

میکوێل وەڵامی نەدایەوە.

کـــاتێ گـــوێی لە تەقەی دەرگە بـــوو، بـــۆ چاوتروکانێک وایزانی ئیتر ناڕەحەتییەکەیان کۆتایی هـات و دایـک گەڕاوەتەوە. پاشـان بـۆی دەرکەوت هەڵـبەت ئەگەر ئەو بـێ، ئەوا چ پێویسـت ناکـا لە دەرگەی ماڵی خۆی بدات. ئەو کەسەی لە دەرگەی دەدا، هەرکەسـێ بـووبێ، هێشـتا هەر لە دەرەوە ڕاوەستابوو. ڕەنگبـێ کەسێک دۆزیبێتیـیەوە، یـان زانیبێتی لە کوێیە. کاتێ بـاوک چـووە دەرەوە بـۆ هۆڵەکە و دەرگەکەی کردەوە، میکوێل بینی جۆیف بێرنات و ژنەکەیەتی. وایدەیزانی ئەوان لە دادگایی کردنەکەوە لێرە نین.

جۆزێـف وتـی: "ئـێمە بینیمـان کەی ڕۆیشـت. پێمـان وا بـوو ئەوە سـاتەوەختێکی سـەیرە بـۆ ڕۆیشتن. جانتایەکیشی پێ بوو".

ژنەکەی ئەوەشـی بـۆ قسـەکان زیـاد کـرد: "جانتای بازاڕکردن بوو".

- بۆیە پێمان سەیر بوو چونکە دوکان لەوێوە نییە.

باوکی میکوێل وتی: "هەڵبەت چۆتەوە بۆ ماڵی باوکی لە پالووسا".

جۆێف پرسی: "ئەدی نەتدەتوانی خۆت بە جێبەکە بیگەیەنیت؟".

کاتێ باوک هەمدیس هەناسەی هەڵکێشایەوە، میکوێل ڕۆیشت بەرەو لای پەنجەرەکە و لەوێوە بینی هێشتا دەرەوە هەر زریان و بەفر کرێوە دەکا. هاوسێکان هەر وەستابوون، کەس داوای لێ نەدەکردن پاڵتۆکانیان داکەنن، یاخود لێیان بپرسن ئاخۆ حەز ناکەن شتێک بخۆنەوە. میکوێل هەستی دەکرد جوزێف لە پرسیارەکەی دوایی پەژێوانە. لەژێر لێوەوە زەردەخەنەیەکی بۆ هاوسێکەیان هاتێ و هاوکات باوکیشی ڕووی کرد بەولاوە.

میکوێل وتی: "ئێمە دەبێ بتوانین لای پۆلیس لە لا سێ خەبەری ونبوونی بدەین".

جۆزێـف وەڵامـی دایەوە: "دەشـێت ڕێـگەکە ئێستا شیاو نەبێـت و هێڵـی تەلەفـۆنیش پچڕابـێ. دۆخەکە بەرەو خراپتـــریش دەچـــێ. لەبەرئەوەی ڕێـگەکە دەیبەسـتێ. هیـوادارم بەیـانی زوو پـاکی بکەنەوە".

میکوێل پرسی: "بیرتانە کەی ئەو ڕۆیشت؟".

جوزیف وەڵامی دایەوە: "هێنـد زوو نەبـوو، کە پیاڕاگەییشـتبێ بەر لەوەی بەفـرەکە تێـی بکـات، گەیشتبێتە پالووسا".

میکوێل وتی:" دەکرێ کاتێ بەفر تێی کردووە، ئەو گەڕابێتەوە".

جوزێـــف وتـــی: "لەم کەشـــوهەوا دژوارەدا زەحمەتە بزانرێ ئاخۆ ئاراسـتەی کـوێی گرتـووەتە بەر".

باوکی میکوێل وتی:" ئێستا ئیتر زۆر لەسەری مەڕۆ".

ژنەکەی جوزیف وتی: "تەنها بۆ ئەوە هاتووین بڵێین کاتێ ڕۆژ دەبێتەوە، هەموو پیاوانی گوند بە نیازن هەر کە دونیا ڕووناک بۆوە، بە دوایدا بکەونە گەڕان، بەڵام ئێستا ناتوانن. بەفر بۆ ماوەیەکی درێژ خۆش ناکاتەوە. ناتوانن لەم کەشوهەوا دژوارەدا بچنە دەرەوە".

باوکی میکوێل وتی: "دەی ئیتر بەسە".

وای وت، دانیشت و هەناسەی هەڵکێشا: "کەس ناتوانێ لە شەوێکی ئاوهادا لە دەرەوە بێ و ڕەق نەبێتەوە".

جوزیف وتی: "خودا دەیزانێ".

باوکی میکویل وتی: "سبەی باسی ئەمە دەکەین. دەتوانین داوا لە پۆلیس بکەین هەر کاتێ گەییشتە پالووسا، ئاگادارمان بکەنەوە".

کاتێ جۆزیف بیرنات و ژنەکەی ڕۆیشتن، میکوێل چووە پاڵ باوکی و هاوسێکانی بینین، کە بە بەفرەکەدا دەڕۆیشتن. پاشان میکوێل چووە

دەرەوە تا بزانێ مامرەکان دانی پێویستیان هەیە و هاوکاتیش هێلکەکانیانی کۆکردنەوە. دواتر خۆراکی کەروێشکەکانی دا و دەرگەی کولانەکەیانی بۆ شەو داخست. لە دالانەکەدا هەندێک بەرماوەی خواردنی دایە کلـوا کە پێـدەچوو برسـێتی تەنگـی پـێ هەڵچنیبـێ، لە کاتێکـدا بـاوک لای مێـزەکەوە دانیشـت، شـەش هـێلکەی کـردە ڕۆنەوە و لـێگەڕا ڕۆنەکە بەسـەر کاشـی دەورانـدەوری تەبـاخەکەدا، شتێک کە دایک هەرگیز نەیدەکرد، هەڵقرچێ. سێ هێلکەی کردە دەفرێکەوە بۆ باوک و سیانیش بۆ خـۆی. لە کاتێکـدا لە بێدەنگییـدا دەیـانخوارد، میکوێـل هەمـدیس و هەمدیسـان بیـری لەوە دەکردەوە دەشـێ ئەوەی ڕوویـداوە هەر بە ڕاسـتی ڕووی نەدابێ، دەشێ خەونێکی درێژ بـێ و زوو بە زوو وەئاگا بێتەوە لێی، یان دیمەنێکی شانۆیی بێ کە لە ناکاوێکڕا دەگۆڕێتە سەر دیمەنێکی نـوێی لە دەرگادان یان ڕاوەستانی جێبێک لە دەرەوە یاخود

دەرکەوتنی ڕوخساری دایکی بە زەردەخەنە شەرمنۆکەکەیەوە لەبەر پەنجەرەکەدا و ئەمانیش هەردووکیان لەسەر نانخواردنەکە هەڵدەستن تا دەرگەی لێ بکەنەوە و بیهێننە ژوورەوە.

بەیانی لە دەنگی تەپەی پێ لەسەر پێپلیکانەکان وەئاگا بۆوە، تەپەی چەکمە لەسەر ئەرزە تەختەییەکە لە خوارەوە و دەنگەدەنگی پیاوان. بەپەلە لە ژووری نووستنە شەختەئاساکەدا خۆی گۆڕی و بەرلەوەی پەنجەرەکە بکاتەوە و دونیایەکی واقوڕمێنەری سپی ببینێ. چووە خوارەوە، پێنج شەش پیاوی گوند لەوێ بوون، یەکێکیان تونگەیەک قاوە و نەختێ کۆنیاکی پێ بوو. پێیوابوو باوکی لە پاڵ پیاوەکانی تردا داماو و بنئاوکەتوو دەنوێنێ. بیری لەوە کردەوە بە درێژایی ژیانی، بە دەگمەن پیاوانی تری لەم موبەقەدا بینیون، بێجگە لە هەندێکجار خاڵۆی و پۆستەچییەکە، یاخود پیاوانێک کە دەهاتن شت

بفرۆشن، یان شتێک چاک بکەنەوە، بەڵام بە جۆرێک لە جۆران هەمیشە لەوێدا لە پەراوێزدا دەبوون. بەڵام ئەم پیاوانە لە شەبەقەوە هەستابوون و خۆیان بۆ گەڕان بە دوای دایکدا ئامادە کردبوو، لە نێوەڕاستی ژوورەکەدا ڕاوەستابوون: ئەمانە چاوان زیت و متمانەبەخۆ و پڕڕوو بوون.

لەسەر پێپلیکانەکەی دەرەوە سەگەکانیان چاوەڕێ بوون. سەرمایەکی تیژ و بەفر هێشتا هەر دەباری، لە شەودا تا سەر ئەژنۆ تێی کردبوو. میکوێل پێیوابوو زەحمەتە لە ڕەوشێکی ئاوهادا خۆ بگەیەنرێتە هیچ شوێنێک. هاوسێکان لەسەر ئەوە کۆک بوون، کە دایک سێ سەعات زیاتر بەر لە بارینی بەفرەکە ڕۆیشتووە. ناچێتە ئەقڵەوە لەو نزیکانە کەوتبێ یان پەنای لە جێگەیەکدا گرتبێ. بەفر هەموو چەشنە ئاسەوارێکی سڕیبۆوە، کە بکرێ لە دوای خۆیەوە جێیهێشتبن و وەکوتریش

دونیا ئەمەندە سارد بوو لەوانە بوو سەگەکان بۆنی هیچ شتێک لە هەوادا نەکەن. تاقە ئومێدیان ئەوە بوو گورجوگۆڵانە ڕێی کردبێ یان لە ڕێگە ڕێکەوتی کەسێکی کردبێ و یارمەتی دابێ تا بەر لەوەی دونیا بە ڕاستی تاریک داهاتبێ و بەفر بەو خەستییە تێی کردبێ، خۆی گەیاندبێتە ماڵی براکەی.

پیاوەکان هێور و شێلگیرانە وەجووڵە کەوتن. میکوێل دڵی خەبەری دابوو، کە هەمووان وەک ئەم، گەڕانەکەیان بە لاوە ئاسنی سارد کوتانە، تەنانەت ناتوانرێ تەرمێکیش لەژێر ڕووپۆشی ئەو بەفرە دڵڕەقەدا بدۆزرێتەوە، لەو دۆخەی ئێستاشدا مەحاڵە تەنانەت خۆ بگەیەنرێتە کول دێل سو. پێیوابوو ئەو پیاوانەش هەر وا بیر دەکەنەوە، لەبەرئەوە هیچیان پێ نەدەکرا، ئەوەش بە لایەک کە حەزیان بە چارەی باوکیشی نەدەکرد. نەیانویستووە وا بزانرێ تەمەڵ و تەوەزەل لە

ماڵەوە دانیشتوون، یان خەریکی ئیشوکاری هاکەزایین لە کاتێکدا کە ژنێکی گوند لە بەفردا شوێنبزر بووە. لەبەرئەوە بە درێژایی تاقی بەیانی، چالاک و زیت و گورجوگۆڵ هەمان ئەو ڕێگەیەیان گرتەبەر، کە دەبێ دایک گرتبێتییە بەر. تەنها کاتێ دەوەستان، کە قومێک لە مەتارۆکەی کۆنیاکەکەیان هەڵدەدا و نەختێک نان و کۆرفی ساردیان دەخوارد. زۆر کەم قسانیان لەگەڵ یەکدیدا دەکرد، بەڵام هەر هیچ قسەیەکیان لەگەڵ میکوێل یان باوکیدا نەدەکرد.

کات گەییبووە نیوەڕۆ و بەفر هەر تێی دەکرد، هێشتا نەگەییشتبوونە کڵێسای سانتا ماگدەلینا کە لەوێوە ڕێگە سەربازییەکە دەستی پێ دەکرد. میکوێل بینی پیاوەکان لەگەڵ یەکدیدا باسوخواستیانە لە کاتێکدا باوک هەر وا بۆ خۆی ڕاوەستا بوو. تێگەییشت دەیانەوێ دەست لە گەڕانەکەی ئەمڕۆ هەڵبگرن، گەڕانەوە بۆ گوند سێ

سـەعاتی پـێ دەچـوو. واتە دەیـانتوانی نـزیکەی سەعاتێکی تریش لە گەڕان بەردەوام بن ئینجا بەر لە خۆرئاوابوون دەگەییشتنەوە گوند، بەڵام دیاربوو شەکەت ببوون، هەر هەنگاوێک لەو بەفرە قـووڵەدا باجی خـۆی هەبـوو، کـاتێ دەگەنە مـاڵەوە، تەواو نیوەمردوو دەبن.

خەون بینـــین هاســـانترە لە ئەنجامــدانی هەر شــتێک، خەون بەوەوە کە خــاڵۆی، لە پۆلســـاوە دایکی دەگەیەنێتەوە ماڵەوە دوای ئەوەی شەوێکی لەوێ بـردووەتە سـەر. خەون بەوەوە کە هاوکـات لەگەڵ گەیشتنەوەی ئەماندا، جێـبەکەی خـاڵۆی لە گونـد پەیـدا دەبێـت. کـاتێ گەڕانەوە، میکوێـل بە تەواوی لە دڵـی چەسـپی بـوو هەمـووان دەیـانزانی دایکی نەماوە، لە دڵی چەسپی بوو، پیاوانی گوند لەبەرئەوە لەگەڵ ئەم و باوکیان شانیان دابووە بەر ئەو گەڕانە بـــێ مانـــایە، وەک شـــێوازێک بـــۆ ڕەوانـــدنەوەی خەیـــاڵ لە دەوری ئەو حەقـــیقەتە

تاڵەی کە دایک نەماوە، کە لە شوێنێکی نزیک یان لە خوار کول دێل سۆوە کەوتووە و مەترێک، یان زیاتر بەفری لەسەر نیشتووە، کە ئەو هەرگیز بۆ ماڵەوە بۆ لایان ناگەڕێتەوە، مەگەر کاتێ دەیدۆزنەوە تابووتەکەی بە ماڵدا بکەنەوە. واتە گەڕان شێوازێکە وایان لێ دەکا لەگەڵ ئەو دۆخە تازەیەدا ڕابێن بەبێ ئەوەی پێویست بکا تەواوی ڕۆژ لە ماڵێکی چۆڵدا دانیشن، بەبێ ئەوەی شتێک ڕوویدا و بەبێ ئەوەی چ شتێک بگوترێ.

کاتێ گەییشتنەوە گوند، جیپێکی پۆلیس لەبەر دەرگەی ماڵەوەیاندا وەستابوو، لە ناویدا دوو ئەندامی گواردیا سیڤیل بە جلکی سەربازییەوە دانیشتبوون، هەر کە گروپەکە بە گوندنشینانەوە کەوتنە مەودای بینینەوە، یەکێک لە پۆلیسەکان لە جیپەکە دابەزی و پاشان کە نزیکتر بوونەوە، پۆلیسەکەی تریشیان، کە لە جێگەی سەرنشیندا دانیشتبوو، لە جیپەکە دابەزی. ئەمیان زۆر جاحێڵ

بوو، میکوێل سەرنجی دا تا ڕادەیەک شەرمنیش دیارە. شەپقەکەی بە دەستەوە و هاوکاتییش تەماشای پیاوەکانی دەکرد، کە بەرەو لای دەهاتن و پاشان ڕووی بۆ دوور وەرگێڕا. هاوکارەکەی، شۆفێرەکە، تەمەن ناوەند و کورتە بالا و چاخ و شەپقەی لەسەردا نەبوو. میکوێل بینی چۆن سەرنجی لەم و باوکی دا، دەبوو پێویست بێ قسەیان لەگەڵدا بکات، بیری بۆ ئەوەش چوو ئاخۆ چۆن پۆلیس ئاگادار کرابێتەوە. کاتێ نزیک جێبەکە بوونەوە، میکوێل تەماشایەکی دواوەی جێبەکەی کرد تا بزانێ ئاخۆ دایک دۆزراوەتەوە و تەرمەکەی هێنراوەتەوە. بەڵام جگە لە فەرشێکی کۆن، هیچی تێدا نەبوو.

هەر کە خۆیان بە ماڵدا کرد، باوک ڕوونی کردەوە کە زۆر بە باشیی دەکرێ ژنەکەی مابێ، زۆر بە باشی دەکرێ خۆی گەیاندبێتە پولسا و لە ماڵی براکەی بێت. پۆلیسە بە تەمەنترەکەیان ناوی

بـراکەی نووسـی و بە شـێوەزارە نمـوونەییەکەی باشـوور وتـی ئەگەر ئەو تـاقە هـێڵەی تەلەفـۆن لەگەڵ پۆلسـادا، ڕاسـتتر لەگەڵ بـنکەی پۆلیسـی ئەوێـدا، هەمـدیس کەوتبێـتەوە ئـیش، ئەوا کە دەگەڕێـتەوە بـۆ لاسیو، دەسـبەجێ تەلەفۆنیـان لەگەڵ دەکـا، خـۆ ئەگەر ڕێـگەکەش لە بەفـر پاککرابێتەوە، ئەوا ئەم خۆی بۆ پولسا دەچێت. بۆ ئەوەش پێویستی بە ناونیشانێکی ئەوێ دەبێ.

هاوکـات، کە بـاوکی میکوێـل دەدوا و پۆلیسـەکەش شـتەکانی دەنووسـین، پۆلیسـە گەنـجەکە ڕووە و دیـوارەکە، هەر تەواو لە نـاو دەرگەی مـوبەقەکەدا، ڕاوەسـتابوو، کـڵاوەکەی ڕاکێشابووە دوای سەرییەوە بە جۆرێک کە میکوێل دەیتوانی نێوچەوانە پاکە سافەکەی و چاوە ڕەشـە گەورەکانی ببینـێ. ڕوانینـی بە ژوورەکەدا دەگەڕا، پێـدەچوو بـۆ مـاوەیەکی کـورت نیگـای لەسـەر قسەوباسـەکەی دوو پیـاوە بە تەمەنـترەکە بێـت و

پاشان نیگای لە نیگای میکوێلەوە ئالاّ. میکوێل ئاگاداربوو کە هەر لەو کاتەوەی هاتبووە ژوورەوە، چاوی لەسەر ئەو پیاوە گەنجە داندەگرت و باشترین شتیش ئەوە بوو ئێستا ڕوانینی بۆ دوور وەربگێڕێ، لێ گەڕێ ئەوەی ڕوویداوە تەنها وەک ساتێکی هاکەزایی سەرنجدان تەماشا بکرێ و لەوەندە زیاتر نا. بەلاّم ڕووی بۆ دوور وەرنەگێڕا، لە ڕوخساری پۆلیسە گەنجەکە لە ڕۆشنایی تاریکیی موبەقەکەدا ورد دەبۆوە، لە ڕەنگی گەرم و سووری لێوەکانی، لە لاتیژیی پێچەقێنانەی شەویلگە و چەناگەی و پاشان لە چاوە میهرەبانەکانی بە برژانگە درێژکۆلە کچانەکەیەوە وردبۆوە. ئەو پۆلیسە گەنجە بە نۆرەی خۆی تەنها لە چاوانی میکوێلی دەنۆڕی، نیگای سارد و بێ گوزارشت وەک ئەوەی توندوتیژو و ڕەق، بە شتێک تاوانباری بکا. کاتێک میکوێل سەری داگرت تا تەماشای نووسینی پۆلیسەکە بکات، ئەویش

سەری داگرت و بە خێرایی زەردەخەنەی هاتێ و بەرلەوەی قڵافەتی پێشووی لە خۆبگرێتەوە، زاری هەڵێنا، بەڵام ئێستا بە توندوتیژییەکی گەورەتر و تا ڕادەیەک ئاژەڵانەشەوە، کە نێچیرێک دەخاتە مەودای بینین و نیشانە لێگرتنەوەوە.

کاتێ هاوکارەکەی شتەکانی نووسین و دیاربوو ئیدی ئامادەی ڕۆیشتنە، پۆلیسە جاحێڵەکە کڵاوەکەی داگرت. میکوێل لەوبەری ژوورەکەوە وەک وەڵامێک سەری بۆ لەقاند. پاشان پۆلیسە گەنجەکە کە هێشتا دوولێوەی نەکردبوو، ئاوڕی دایەوە، دەرگەکەی کردەوە و لێ گەڕا لە پێشدا بچێتە دەرەوە، ئاماژەی بۆ باوکی میکوێل کرد دوای بکەوێت، میکوێل وای بە خەیاڵدا هات، پۆلیسە گەنجەکە هەوڵ دەدا دەرفەتێک بخوڵقێنێ دوو پیاوە بە تەمەنترەکە بچنە دەرەوە و ئەمانیش هەردووکیان لەلای دەرگەکەوە یاخود لە هۆڵەکەدا بمێننەوە. بەڵام باوکی میکوێل، لە ڕووی

نەزاکەتەوە کە دەبوو پۆلیسە گەنجەکە بەر لەو بچێتە دەرەوە، لە ناو دەرگەکەدا ڕاوەستا. میکوێل بە وردی لە پۆلیسە گەنجەکەی دەنۆڕی و هاوکات هاوکارەکەی، جێبەکەی هێنایە دوا و پێچی کردەوە و بەر لەوەی بکەوێتە ڕێ، کەمێک هێواشی کردەوە.

کاتێک میکوێل کەوتە ئەنجامدانی ئەو ئیشوکارانەی کە دایکی دەیکردن، باوک چووە دەرەوە و کەوتە داربڕین، شێلگیرانە تەوری دەوەشاند، کۆتەرە دارەکانی دوو لەت دەکردن تا هاسانتر بسووتێن. میکوێل بیری شەوی کەوتەوە و ترس دایگرت کاتێ کە هیچ شتێک نامێنێتەوە بیکەن، جگە لە چاوەڕوانیی هەواڵێکی دایکی، دەشیزانی کە دەشێ گەییشتنی ئەو هەواڵە زۆری پێی بچێت.

یارییەکی بیرهاتەوە کە کاتێ پێی گرتبوو، لەگەڵ دایکیدا دەیکرد. نەیدەزانی چۆن بیرۆکەی

ئەو یارییە دروست بوو، بەڵام کاتێ دایکی لە ژوورەوە دەبوو، ئەم خۆی لە بن مێز، یان ژێر تەختەخەوەکە، یاخود لە پشت کورسییەکەوە دەشاردەوە، پاشان دایکی وای دەنواند ناتوانێ بیدۆزێتەوە، ئیدی هەردوو لایان لێدەگەڕان یارییەکە بەردەوام بێ تا ئەوکاتەی کە ئەم هەر تەواو ترس دایدەگرت. ئەوسا دەهاتە پێشەوە و ئەویش وا دەینواند، کە دەست لەسەر دڵ و تامەزرۆیەتی، ئینجا هەڵیدەگرت و بەرزی دەکردەوە. میکوێل بیری نەدەهاتەوە ئاخۆ کە باوکی لەوێ بووبێ، ئەو یارییەی کردبێ، کاتێکیش جوردی کەوتە ئەوەی فام بکاتەوە، زەندەقی لەو چاوشارکێیە دەچوو، پاشان هەستێک بە ئیرەیی دایدەگرت کاتێ هاواری سەرکەوتنی لە دایک و براکەیەوە بۆ دۆزینەوەکە دەژنەوت. ئێستا کاتێ میکوێل بە ماڵەکەدا دەگەڕا، هەر زۆر ئاگای لە قوژبنە تاریکەکان کە لە خۆرئاوابووندا تاریکتر

دەیاننواند، دەبوو. شوێنگەلێک کە بنیادەم دەیتوانی خۆیان تێدا حەشار بدا و پاشان لێیان هەڵقونێتە دەرێ، وەک ئەوەی دایک بە شێوەیەکی سەیر بگەڕێتەوە و لە جێگەیەکدا خۆی بشارێتەوە کە هاسان تیایدا نادۆزرێتەوە.

ئەو شەوە بە بێدەنگیی چەند هێلکەیەکیان بە هێلکە و ڕۆن و نانی ڕەق و کۆرفی ساردەوە خوارد تا میکوێل لە باوکی پرسی ئاخۆ ئەدی جوردی چۆن. تەنانەت ئەگەر هیچ ئەدرێسێکی ئەویان لەلا نەبێ و نەزانن کەوتۆتە کوێوە، خۆ دەتوانن لە لا سێ داوا لە پۆلیس بکەن، کە پێوەندی لەگەڵ بگرن.

باوک پرسی: "ئەی چی پێ بگوترێ؟".

میکوێل وەڵامی نەدایەوە.

باوک وتی: "ئەو بەشی خۆی خەمی هەیە".

- ڕەنگە لە کەسێکی ترەوە هەواڵەکە ببیستێ.

- بۆ جێگەیەکی هێند نزیک نەچووە هەواڵی ئێرەی بگاتێ.

میکوێل وتی: "دەکرێ خەڵکی ئێرە ببینێ. بونیادەم نازانێ ڕێکەوتی کێ دەکا. ڕێکەوتی کەسێک کە هەواڵەکەی بیستبێ".

باوک وتی: "جارێ ئێمە هیچ ناڵێین، هیچی بۆ ناگێڕینەوە. لێدەگەڕێین ئاسوودە بژی".

کاتێ شێویان کرد، فۆیکس هات کە بەدرێژایی ڕۆژەکە پێشەنگایەتی گەڕانەکەی کردبوو، لە دەرگای دا، بەڵام نەیدەویست بێتە ژوورەوە ئەگەرچییش بەفر لە دەرەوە کڕێوەی دەکرد. فویکس وتی هێشتا هێڵەکانی تەلەفۆن هەر پچڕاون. ئەوەشی بۆ قسەکانی زیاد کرد، کە ئاوەڵزاوەکەی توانیویەتی بە دوو سەگی ڕاهێنراو لەسەر شوێنپێ هەڵگرتنی بۆن، خۆی بگەیەنێتە گوند. وتی ئەو پێشتر بەکاری هێناون و بێ هاوتا بوون. کەواتە هەر کە دونیا ڕووناک دەبێتەوە

هەموو ئەو پیاوانەی لە گەڕانەکەی ئەمڕۆدا بەشدار بـــوون، هەمـــدیس دەکەونەوە گەڕان ئەگەرچـــی لەوانەشە کارەکەیان لە ڕۆژی پێشوو دژوارتر بێت لەبەرئەوەی دەشێ لە شەودا بەفرێکی زۆرتـر تێی بکات.

بەرلەوەی بڕۆن و ڕاکشێن، باوکی، بە میکوێلی وت بە نیازە سبەینێ هەوڵ بدا جێبەکە بەرەو لا سیۆ بئـاژوێ و لەوێـوە بە ڕێـگە قیـرەکەدا بەرەو سـورت و پاشـانیش گەر بلـوێ، بەرەو پۆلسـا. میکوێل وتی دەبێ ئەو لەگەڵ پیاوەکانی تردا بێت، بەڵام کـاتێ چـووە بـرت پەنـجەرەکە و تەماشـای دەرەوەی کرد و بینی بەفـر تونـدتر کرێـوە دەکا، پێیوابـــوو ســـبەی گەڕانەکەی نە بـــاوکی و نە پیاوەکانی تریش چ بوومێکی ئەوتۆی نابێـت. خۆ ئەگەر بەفـــر وەک ئێســـتا ببارێـــت ئەوا ڕەنـــگە گوندەکەیش لە دونیای دەرەوە دابـبڕێت.

میکوێل بیری کردەوە خۆی و باوکی بە نا ئامادەییەکی گەورەوە، بە تەنها لە ژوورەکاندا دەنوون. دژوار بوو بزانیت کە هەردوو دایک و جوردی لەوێ نین، خۆ ئەگەر جوردی بگەڕێتەوە و دایک نا، ئەوا بەهێزتر هەست بە نەبوونی دەکرێت. بۆ ساتێک خۆی دا بە تەختەخەوەکەی جوردی دا تا سەرما ناچاری کرد خۆی بخزێنێتە ژێر بەتانییەکانی خۆیەوە. حەزی دەکرد ئەوەی ڕوویداوە، دوو هەفتە لەوەوبەر، بەرلەوەی جوردی بەرەو سەربازی بڕوات، ڕوویدابا، حەزی دەکرد سێ ساڵ لەوەوبەر ڕوویدابا، کاتێک کە هەر هەمان دەقیقە بۆ ماڵەوە گەڕابۆوە، حەزی دەکرد هەر کاتێکی تر ڕووی دابایە، تەنها ئێستا نا.

بۆ بەیانی سەرلەنوێ بە جیرەی زەوینی تەختەیی ژوورەکەی خوارەوە، وەئاگابۆوە. قووڵ نووستبوو، پەرۆشی کاتی زیاتر بوو لەو فەرامۆشییەدا کە هەر ئێستا لێی دەرکێشرا بوو.

دەسبەجێ حاڵی بوو دەبێ هەستێ و بە درێژایی ڕۆژەکە لەو سەرما گەزێنەرەدا کە بەفر دزە دەکاتە پووتەکانییەوە و قامکی پێیەکانیشی وەک پەنجەکانی دەستی دەیبەستن، خەریکی گەڕان بە دوای دایکیدا بێ. تەماشای تەختەخەوەکەی جوردی کرد. ئەگەر تەنها خۆی باش گردکردبایەوە ڕەنگە بیتوانیبا پێوەندی لەگەڵ گرتبا و دڵنیای کردبایەوە، کە سەرەڕای زستان، هەمووان باشن، کە چ شتێکی نوێ نییە بۆی بگێڕێتەوە و لەوەتی ئەو ڕۆیشتووە هیچ شتێک ڕووی نەداوە.

کاتێ میکوێل بۆ موبەقەکە هاتە خوارەوە، فویکس بردییە لاوە و وتی هەر دوو ئەو سەگەی کە لە دەرەوە چاوەڕوانن، پێویستیان بە بۆنێکە تا گەڕانەکەیانی پێ دەست پێ بکەن، چەندێکیش بۆنەکە دیارتر بێ ئەوا چانسی دۆزینەوەی دایکی زیاترە. وتی لەبەرئەوە پێویستی بە شتێکی دایکییەتی، شتێک کە لەبەری کردبێ. قسەکانی

کرد بە چرپە کاتێ باسی ئەوەی بۆ میکوێل کرد کە جلەکان چ کەڵکێکی ئەوتۆیان نابێت گەر دوای لەبەرکردنیان شۆردرابن، چەندێک جلەکانیش لە کاتی پۆشینیاندا لە جەستەوە نزیکتر بوون، هێندە بەکەڵکتر دەبن. بە جۆرێک تەماشای میکوێلی دەکرد وەک ئەوەی نەک هەر بە تەنها پیلان دژی هەموو خەڵکانی نێو ژوورەکە دەچنن، بەڵکو پیلان دژی دونیا بە بەفر پۆشراوەکەی دەرەوەش.

باوکی میکوێل کە ئێستا پێیوابوو ناتوانێ جێبەکە بەو هەورازە لێژەی دوای لۆفەکەی ڕێگەی گوند بەرەو لا سێو بئاژوێ، بە تەنیا لای مێزەکەوە دانیشت لە کاتێکدا لەو بەیانییە شەختەبەندەدا، زۆر پیاو دەهاتن و زۆر سەگ دەوەڕین. بەفرەکە لە شەودا خۆشی کردبۆوە: بەر لە کازیوە پلەی گەرما دابەزی بوو، ئەوەش مانای ئەوە بوو دەبێ ئاگایان لە پەڵەبەفر و هەروا لە بەفری قووڵ بێت. باوک داچۆڕاو و کاس کەوتی و دوور لە هەموو ئەو

شتانەی لە دەوروبەریدا ڕوویان دابوو، دەینواند.
میکوێل بڕیاری دا بە داواکارییەکەی فویکس، ناڕەحەتی نەکات، بەڵکو خۆی چووە سەرەوە و هەوڵیدا پارچەیەک جلکی دایکی بدۆزێتەوە، کە بۆنەکەی پێوە مابێت.

بیری چووبۆوە کەنتۆری ژێر پەنجەرەی ژووری نووستنەکەی دایک و باوکی چۆناوچۆنییە. ئاخر ئەو ساڵانێکی زۆر بوو نزیکی ئەو ژوورە نەکەوتبۆوە، بەڵام کاتێک بچکۆلە بوو، بە ئاگالێبوونی دایکی، زۆر تامەزرۆی کردنەوەی چەکمەجە بە چەکمەجە و دەرهێنانی شتەکانی ناویان و پاشان قەدکردنی هەموو شتێک و دانانەوەیان بوو ڕێک وەک پێشوو لە جێگەی خۆیاندا. لە لایەکی چەکمەجەکەی سەری سەرەوەدا کاخەز و پسووڵەنامە و وەسڵ و دەسەسڕ و ملپێچ دانرابوون و لە لاکەی تریدا. لە چەکمەجەکەی ناوەڕاستدا بلوز و فانیلە و لە دوو

چەکمەجەکەی خواری خوارەوەشدا دەرپێی کورت.
کاتێ ئەو چەکمەجانەی کردنەوە، بۆنی دایکییان لێ نەدەهات، بەڵکو بۆنی گوڵە لەوانتە و عەتر. دەستی لە هیچەوە نەدا، هیچ شتێک لەوێ نەبوو، کە بە کەڵکی فویکس و سەگەکانی بێت.

لە قوژبنێکی ژوورەکەدا زەمیلە کۆنەکە دانرابوو بە هەمان قەبارەی ئەو دانەیەی ژوورەکەی خۆی کە جلکی چڵکنی تێ دەکرد. زەمیلەکە نیوە پڕ بوو: لە سەری سەرەوە کراسەکانی باوک لەگەڵ چەند گۆرەوی و دەرپێی کورت و هێلەکێک. لە خواری خوارەوەش، لە بنەوەڕا، دوایین ئەو شتانە هەبوون کە دایک بۆ دواجار لەمماڵەدا لەبەری کردبوون، وەک بلوسەکەی کاتی شێوکردن، میکوێل پێیوابوو لەوانەیە ئەوەیان بێ کە بۆ جوردی پۆشیبووی، داینابوو تا بە شێوەیەکی تایبەتی بیشوا و وشکی بکاتەوە. لەژێریدا چەند دەرپێیەکی کورت هەبوون، میکوێل دەستی دانێ و

هەڵیگرتن، دوای ئەوەی لەوە دڵنیا بوو، کە کەسی
لە دواوە نییە، بەرەو کەپووی بردن. ڕوخساری
نووساند بە بۆنە گەرم و گوڕەکەیەوە، کە وێڕای
ئەوەی چەند ڕۆژێک تێپەڕی بوو ئەو دەرپێ
کورتانەی لەبەر کردبوون، کەچی هێشتا بە ئاشکرا
بۆنەکەیان پێوە مابوو. ئەوە هەستێکی بەهێزی
ئامادەیی دایکی لە ژوورەکەدا لەگەڵ خۆیدا هێنا و
بۆ ماوەیەکی کەم سەگەکانی وەک کوێر لەبەرچاوی
خۆیدا بەرجەستە کرد، کە بەنێو بەفرەکەدا
ڕادەکەن و تەنهاو تەنها لەپێناو ئەو بۆنەدا دەژین،
لە ژێر بەفر یان لە جێگە ڕووتەنەکاندا بە دوای
خاوەنە دانسقەکەیدا دەگەڕێن. ئەمیش دەبێ لە
دوایانەوە بڕوات. هەر هەموو دەرپێ کورتەکانی
جگە لە یەکێکیان خستنە زەمیلەکەوە و کردنی بە
ژێر جلکەکانی باوکییەوە، ئەو دانەیەش کە
هەڵیبژاردبوو، هەڵگرت و بە پێپلیکانەکەدا هێنایە

خـوارەوە و دای بە فـویکس کە لەگەڵ سـەگەکاندا لەودیو دەرگەوە ڕاوەستاو و چاوەڕێی دەکرد.

دونیـا لە ڕۆژی پێشـوو هەر زۆر سـاردتر و ڕێ کردن زۆر زەحـمەت بـوو. هەردوو سـەگە نـوێیەکە شوێنپێی بۆنەکەیان هەڵدەگرت و لە ڕێـگەکەوە بە بەرزایی یاڵەکانـدا هەڵ دەگەڕان و پیاوەکـانیش لە نشـێودا چاوەڕێیـان دەکـردن. بـاوکی میکوێـل بە زۆریی لە دوای دواوە دەبوو، هیچ بەرداشـتێکی نە لە بە دوادا گەڕانەکەدا هەبـوو نە تەماشـای ئەو شوێنپێیانەشی دەکرد، کە دەکرا شتێکیان لەبارەی چارەنووسـی دایـکەوە لـێ هەڵبکـرێ. میکوێـل سـەرنجی دەدا فـویکس و کاسـتالێت و چەنـد کەسێکی تر بە لاچاو بۆ دواوە لەویان دەنۆڕی، بە ئاشکرا تـووڕەیی دایگرتبـوون. هەروەهـا سـەرنجی ئەوەشی دا هاوسێکیان لە دووەمین ڕۆژی بە دوادا گەڕانەکەدا، چالاکترن، دیـاربوو کەیفیـان بە هـاوار لێ کردنی سەگەکان ساز بووبـوو، تـا کـات زیـاتر

تێپەڕیبا سەرحاڵتر دەبوون. ئەو خۆ پێوەخەریک کردنەی ئەوان بە سەگەکانەوە بوو کە وای لە باوک کردبوو بێ مەیل بێ، بە زۆریی بێ تاقەت خۆی بە دوایاندا کێش دەکرد وەک ئەوەی تەنها غەمی ئەوەی بێ پێوپلی تەڕ نەبێ.

میکوێل پێیوابوو دوو سەگەکە زیاتر بە گوڕ و وزەن وەک لەوەی زیرەک بن. لە خەیاڵی ئەوەدا بوو بۆچی فویکس لەو شتە تێ ناگات، کە ئەم تێی دەگات، لەوە تێ ناگات ئەگەر کەسێک بە ژێر بەفرەلووکەیەکی سەهۆڵینەوە بووبێ، ئیدی زەحمەتە هیچ بۆنێک بدات. بەڵام ئەوەشی دەزانی کە هیچ شتێکی تر ناکرێ جگە لەوەی بۆ پێشەوە بە ڕێگەیەکدا بڕۆن، کە مەگەر هەر تەنها شوێنپێی ڕێوی و بەرازە کێویی لەسەر بناسنەوە، ڕێگەیەکی تەختانیی و سپیایەتییەکی پاقیژە، ئەوەی لەسەری دەردەکەوێ، شتێکی دەست لێ نەدراو و تا ڕادەیەک جوان و تەواو بێ مەترسییە، کارەکتەرە

هەڵخەڵەتێنەرەکەی بۆنەکە، چەند چینێک لەژێر ئەو ڕووبەرە سپییەدا ڕاکشاوە.

لە دوای نیوەڕۆوە چیدی نەیانتوانی بەردەوام بن، بەفر زۆر خەست تێی کردبوو، زەحمەت بوو بڕیار بدرێ ئاخۆ ڕێگەکەی بەردەمیان بەرەو نشێوە، یاخود ڕووەو هەوراز، یاخود نشێوەکە لە کوێدا و چۆن لێژ بۆتەوە. سەگەکان کە هەر لە بەیانی زووەوە هیچیان نەخواردبوو، هەرچی زیاتر دژوارتر دەبوو کۆنترۆڵی دۆخەکە بکەن، دوانیان کە لە گوندەوە هاتبوون، لەگەڵ یەکدیدا لێیان بووە هەرا، دەیانمڕاند و دەوەڕین و هاوکاتیش قەپاڵیان لە یەکدی دەگرت، پاشان لەلایەن خاوەنەکانیانەوە پەت کران و دوایش بۆ ملکەچییەکی زۆرەکیی وەدەرنران. میکوێل سەرنجی دا جگە لە خۆی و باوکی کە لەولاوە ڕاوەستابوون و تەماشایان دەکرد، هەموو پیاوەکانی تر خۆیان بەوەوە سەرگەرم کردبوو

سەگەکان لە یەکتر جیابکەنەوە و پەتیان بکەن و هاواریان لێ بکەن، هەستیشی کرد، کە بە تەنیا ڕاوەستانەکەی خۆی و باوکی، ئەوانی تری تووڕە کردووە. لەبەرئەوە دڵخۆش بوو کاتێ دەستیان لە بەدواگەڕانەکە هەڵگرت. یەکەمجار چاوەڕێیان کرد تا هەردوو سەگە نوێیەکە لە سەفەرە بێ هودەکەیان گەڕانەوە و پاشان ڕێگەی ماڵەوەیان گرتە بەر. میکوێل وای بە باش زانی لەگەڵ ئەوانی تردا بڕوات، خۆی بخاتە نێوان دوانیانەوە، یان لە نزیک یەکێکیانەوە بێت. باوک هێندە بە جێما بوو، کە میکوێل چەند جارێک ئاوڕی بۆ دایەوە، نەیدەتوانی بیبینێ.

ئەو ئێوارەیە باوک پێچەقێنانە وتی چیتر ئەو بەدوادا گەڕانە بێ مانایانە ناکەن، وتی پیاوەکان ڕقیان لێیەتی و ئەو دوو ڕۆژە وەک پیاسەیەکی بێ هودە و وەک شێوازێک تەنها لەپێناو ئازاردان و سووکایەتی پێ کردنی لەگەڵیاندا بوون و چیدی

حەوسەڵەیانی نییە. بۆ سبەینێ وتی دەبێ بچن بۆ لا سێو، لەوێ ڕۆژی هەفتانە بازاڕە. ئەگەر ڕێگەکە کراوە بێت یان داخرابێت، دەبێ تا ئەو جێگەیە بڕۆن، کە داخراوە و لەوێ چاوەڕێ بکەن، یان بەو بەفرەدا درێژە بە ڕۆیشتن بدەن کە ڕێگەکەی داخستووە.

بەبێ ئەوەی ڕاوێژ بە باوکی بکات، میکوێل ڕۆیشت و لە دەرگەی ماڵی فویکس — ی دا، کاتێ هات دەرگەکە بکاتەوە تا ڕادەیەک شەرمەنگێز دەینواند و پرسی چیی دەوێت. میکوێل وتی نیازمان نییە سبەینێ بگەڕێین، بەڵکو بەرەو لا سێو دەڕۆین، لەوێ ڕەنگە خەڵکانێکی دانیشتووی پالووسا ببینن. هەروەها دەشتوانن قسە لەگەڵ پۆلیسدا بکەن. ئەوەشی زیاد کرد، کە سوپاسی فویکس دەکات بۆ هەموو یارمەتییەک.

فویکس پرسی: "ئەی باوکت؟ هەمووان دەزانن توانای قسەکردنی باشە لە قسەکردندا. ئەی ئێستا چییەتی؟ ئەو توانایەی لەدەست داوە؟"

میکوێل لەبەر نیگای بڕندەی فویکس دا بوو.

- ئەو زۆر نائومێدە.

فویکس بەبێ ئەوەی هیچی تر بڵێ، دەرگەکەی داخست. کاتێ میکوێل بۆ ماڵەوە گەڕایەوە، چ شتێکی لەو بارەیەوە بۆ باوکی نەگێڕایەوە.

ڕێگە بەرەو لا سێو کرابۆوە بەڵام شەختەبەند و لە سەعاتەکانی بەربەیانانـدا مەترسیدار بوو. میکوێل نووست و هیچ خەونێکی نەبینی، لە یەکەمین دەقیقەی ڕۆژبوونەوەدا، پێیوابوو کە ئەو ڕۆژە ڕۆژێکی ئاسایی ژیانی دەبێت. ئاخر شەو هەموو یادەوەرییەکانی ئەو چەند ڕۆژەی پێشووی تەفروتوونا کردبوون. بەڵام باوک کاتێ هاتە خوارەوە، میکوێل هەستی دەکرد، کە ئەو هەر هیچ نەنوستووە و هەر زۆریش شەکەت دەینواند، نیوەی

هەموو ڕستەکانی بە بێدەنگیی دەگوتن، ئەوەی لە خەیاڵیدا بوو بیڵێ، بیری دەچووەوە. کەم خەویی وایلێکردبوو، کە بە پارێزتر بئاژوێ و لە پێچ و نشێوەکاندا خێرایی کەم بکاتەوە. تا ڕادەیەک ڕێگە هیچ هاتوچۆیەکی پێوە نەبوو. تەنانەت کاتێ گەییشتنە ڕێگە سەرەکییەکەش، ترومبێلی کەم بە ڕێگەکەوە بوون. ئەوەش لە ڕۆژانی هەفتانەبازاڕدا شتێکی نائاسایی بوو.

دوو هەفتە پێشتر لەگەڵ دایکیدا بەم ڕێگەیەدا هاتبوو، لە ڕیزدا لەگەڵی ڕاوەستابوو، بینیبووی چۆن خۆی لێ دزییەوە تا سێ پەرداخ هەڵقوڕێنێ، ئێستاش وا لەگەڵ باوکدا، بەنێوان مێزی شتفرۆشییەکاندا دەڕۆیشتن کە وەک جاران زوو لە کاتی خۆیدا پێداڕاگەییشتبوون، بگەنە جێ، ئەمجارەیان هاتبوون تا بە دوای کەسێکدا بگەڕێن کە لە پالووسا یان بورج یان تریڤیا یاخود یەکێک لە گوندە نزیکەکانی ئەو دەوروبەرەوە هاتبێ و

هەواڵێکی پێ بێ. میکوێل دەیزانی بە هۆی خراپیی ڕێگە و پچڕانی هێڵی تەلەفۆنەوە، ئەگەری زیاتر ئەوەیە کە کەس هیچ شتێک لەبارەی دایکییەوە نازانێ و پێویستە ئەمان خۆیان شتەکە باس بکەن، وەک ئەوەی ئەوە نهێنییەک بێ و ویژدانی قورس کردبن تا ئەوکاتەی هەواڵەکە دەکەوێتە سەر زاران و بڵاودەبێتەوە. میکوێل بە تەما بوو پێشنیار بۆ باوکی بکا لەجیاتی ئەوەی بە درێژایی ئەو بەیانییە بەو بازارە چۆڵە جنۆکەییەدا بێن و بچن، باشترە پرسیار بکەن ئاخۆ ڕێگەی پالووسا کراوەیە، تا دەسبەجێ بەرەو ئەوێ بئاژوون و بەرلەوەی هەواڵەکە لە کەسێکی ترەوە وەک پڕوپاگەندە یان حەکایەتێکی تەڵخ، ببیستێ، بۆ خاڵۆی باس بکەن.

بوکادیلیۆیەکیان لە بارێک خوارد. هەردووکیان بێ ئەندازە برسییان بوو. کاتێ میکوێل ئەوەی خۆی خوارد، لە کەلـلەی دا بڵێ حەزی لە

دانەیەکی تریشە. بڕیاری دابوو نەختێک خواردنی تر بکڕێ لەبەرئەوەی زیاتر لە سێ ڕۆژ و قسوور بوو تەنها بەو هێلکانە ژیابوون، کە لە کولانەی مریشکەکاندا کۆی کردبوونەوە. بەڵام لەبەرئەوەی باوک دەیویست بۆ بنکەی پۆلیس بچێت، بیری کردەوە دەتوانێ چاوەڕێ بکا، نەختێک قاوە بخواتەوە، دواتر زیاتر، ڕەنگە فراوینێکی حیسابیی بخوات. بەلای مێزی فرۆشیارییەکاندا بە ئاراستەی بنکەی پۆلیس ڕۆیشتن و وایان بە باش زانی تەماشای هیچ کام لە فرۆشیارەکان نەکەن و سڵاویان لێ نەکەن، لەبەرئەوەی حەزیان نەدەکرد ئەو خەڵکانەی لەوێ ڕاوەستابوون، کە ڕەنگبێ شتێکیان لەبارەی ژنە بزربووەکەوە بەرگوێ کەوتبێ، پرسیاریان لەبارەوە لێ بکەن. بەڵام ئەمان هێشتا هەر چاویان بۆ خەڵکانێکی دانیشتووی گوندەکانی دەوروبەری پالووسا دەگێڕا.

کاتێ بە لای جاددەیەکی لاوەکییدا داگەڕان و بە لای نانەواخانەیەکدا تێپەڕین، خالۆ فرانکێس، دانیشتووی پالووسا- یان بینی کە لەگەڵ ژنەکەی و ژنێکی هاوسێیاندا بەرەو ڕوویان دەهاتن. میکوێل دەسبەجێ ڕاوەستا و لێ گەڕا باوک لە پێشەوە بەرەو پیریان بچێت. ئەم خۆی لەناو دەروازەیەکدا ڕاوەستا و باوک سڵاوی لێ کردن. میکوێل لە ڕوخساری خاڵۆ و خاڵۆژنی ڕوانی، بەڵام یەکەمجار نەیتوانی قڵافەتیان بخوێنێتەوە. خاڵۆی تەنها سەری دەلەقاند، خاڵۆژن و هاوسێکەیان بە گرنگیپێدانەوە گوێیان ڕادێرابوو. وردە وردە ڕوخساری خاڵۆ ڕەش داگەڕا، گۆڕانکارییەکە لە ڕوخساریدا گەورە نەبوو، برۆی گرژ نەکرد، یان لچ و لێوی نەجووڵاند، بەڵام ئەوە بۆ میکوێل بەس بوو. بەر لەوەی خاڵۆ بکەوێتە قسە و سەر با بدا و خاڵۆژن دەست بنێتە سەر لێوی و ژنەکەی تر بکەوێتە نەوازشکردنی، تێگەییشت کە دایکی

نەگەیشتۆتە پالووسا، بەو شێوازەشدا کە ئێستا پێ دەچوو خاڵۆ پرسیاری لە باوک پێ بکا، تێگەیشت خاڵۆ و خاڵۆژنی نەیانزانیوە دایکی دیار نەماوە. ئینجا لەبەر سێبەرەکە هاتە دەرێ و بەرەو لایان چوو.

خاڵۆ وتی ڕێگەی پالووسا بۆ ماوەی دوو ڕۆژ داخرا و تاقە هێڵی تەلەفۆنەکەی پالووساش پچڕابوو. میکوێل تەماشای خاڵۆی کرد، کە پێ دەچوو قورس هەناسە بدات، لەنێوان قسەکانیدا هەناسەی قووڵی هەڵدەمژت، لە ئەرزەکەی دەنۆڕی و نێوچەوانی چرچ و لۆچ بووبوو.

وتی:" ئەو ڕۆژەش کە بەفرەکە دایکرد، هێند خەست تێیکرد وێنەی نەبوو، بەفر تا بن قورقوڕاگەمان باری".

میکوێل سەرنجی دا کاتێ خاڵۆ زانی خوشکەکەی سەعات چەند ڕۆیشتووە و کێ بینیویەتی و چەند پێش بارینی بەفرەکە

ڕۆیشتووە، هەوڵ دەدا پرسیارێکی جەوهەریی لە سینگی خۆیدا گڵ بداتەوە. بە ئاشکرا دیار بوو خاڵۆ دەیویست بزانێ دایک لەبەرچی ڕۆیشتووە، کە ڕۆیشتووە چۆن ئەمان سەرنجیان نەداوە و نازانن لە چ وەختێکدا شانی داوەتە بەر سەفەرێکی ئەوەندە مەترسیدار، خۆ ئەگەریش ویستبێتی بۆ پالووسا بێت، ئەی بۆچی بە پێ هاتووە لەکاتێکدا جێبێک لەبەردەم دەرگەیماڵەکەیاندا ڕاوەستاوە. کاتێ خاڵۆ لە نیگاکانی کوڕ و باوک وردبۆوە، میکوێل هەستی کرد چۆن وردە وردە بۆ خاڵۆ دەردەکەوێت کە خوشکەکەی لە تووڕەییدا، یان دوای شەڕێک ڕۆیشتووە، میکوێل پێیوابوو تا زیاتر خاڵۆ لە مەسەلەکە تێدەگەییشت، ئەم و باوک گوناهبارتر وەدیار دەکەوتن.

بڕیاریاندا پێکەوە بۆ بنکەی پۆلیس بچن و بە فەرمی بزربوونی دایک تۆمار بکەن. خاڵۆ پێیوابوو ئیدی بەو شێوەیە پۆلیس بەرپرسیار دەبن، کە بە

دوایـــدا بگەڕێـــن و هەمـــوو تواناکانیـــان بـــۆ ئەو مەبەستە وەگەڕبخەن. میکوێـل دەیزانـی خـاڵۆ بە خـــودان ئـــاوڕووی میهرەبـــانی و ژیریـــی، نـــاوی ڕۆیشتووە، کاتێکیش میکوێل بینی خاڵۆی جڵەوی کێشـەکە دەگـرێتە دەست، بیـری ئەوەی کەوتەوە دایک حەیفی بۆ ئەوە دەخـوارد، کە چ کەسێکی هاوشـــێوەی فـــرانکێس لە گوندەکەیانـــدا نیـــیە، کەسـێک کە ئەگەر بونیـادەم کێشـەیەکی هەبـوو، ڕووی لێ بنێ.

لە نزیک بنکەی پۆلیسەوە، میکوێـل یەکەمجار بە لێڵیـــی و پاشـــان بە ئاشـــکرایی، فـــویکس و کاستالێت — ی بینین کە لەودیو جێبێکەوە لەگەڵ دوو پۆلیسدا ڕاوەستابوون. خاڵۆیش ئەوانی بینین، بەڵام میکوێل پێیوابـوو خـاڵۆ نـازانێ ئەوانە کێن، بـــاوک لەو کـــاتەدا تەماشـــای دواوەی دەکـــرد و مێکـــوێلیش پێیـــنەوت، کە گوندنشـــینەکان لە لاسیۆن.

پۆلیسەکەی لای کارمەزەلەکەوە پێدەچوو ئاگای لە بەسەرهاتەکە بێت و پێیوتن چاوەڕێ بکەن. تەنها دوو کورسی لەو هۆڵە تەنگ و تروسکەدا هەبوو. هەر پێنجیان قاییل نەبوون دانیشن و ئیدی قەرەباڵخییان بۆ هاتنە ژوورەوە و چوونە دەرەوەی پۆلیسەکان دروست کردبوو بە شێوەیەک، کە بەر پاڵ و شان لێدان دەکەوتن و دواجار لە تەنیشت یەکەوە ڕیز بوون. دوای قەیرێک خاڵۆژنی میکوێل و هاوڕێکەی وتیان دەیانەوێ بۆ بازاڕ بچنەوە و دواتر لە قاوەخانەی تەنیشت نانەواخانەکەوە یەکتر دەبیننەوە. میکوێل وتی ئەویش لەگەڵیان دێت، چەند کارێکی لە گۆڕەپانەکە هەن. بیری کردەوە دەشێ ئاوها بۆ باوک هاسانتر بێ، تا لە نەبوونی ئەمدا، ڕاستییەکە بۆ خاڵۆی بگێڕێتەوە. بەر لەوەی بڕوات، سەرنجی دا خاڵۆی چەند بۆشناخە و لەوێ کە لە هۆڵەکەدا چاوەڕێ دەکا، چ چالاک و سەرحاڵ دەنوێنێ. لە

نێزکیشییەوە باوک وەک پیاوێکی هەژاری گوندێکی هەژار دەنوێنێ، پیاوێکی تێکشکاو و پەشۆکاو لە خانووبەرەی فەرمانگەیەکی ئەو شارە گەورەیەدا.

پێکەوە بۆ بازاڕ چوونەوە. تێگەییشت خاڵۆژنی چی بە هاوسێکەیان گوت، چۆن بڕیاریاندا نەختێک دواتر یەکتر ببیننەوە، چونکە دەیویست بە تەنیا لەگەڵ ئەمـــدا بـــێ، پێیوابـــوو دەیەوێ بزانـــێ مەسەلەکە چۆن بووە. خاڵۆژنی حەوسەڵە و ژیریی شـــووەکەی نەبـــوو، کە شـــتەکان بەبـــێ ئەوەی وردەکارییەکانیـان بخـرێنە ڕوو، بە تەواویـی بزانـێ حاڵ و مەسەلە چیی بووە. کاتێ هاوسێ ڕۆیشت، میکوێل سەرنجی دا چۆن خـاڵۆژنی کـێچ کەوتـۆتە کەوڵـــی تـــا شـــت لەبـــارەی هۆکـــاری دیارنەمـــانی دایکیـــیەوە بزانێـــت، میکوێـــل بەبـــێ ئەوەی بزانـــێ بۆچی، بڕیاری دا هیچ لەو بارەیەوە نەڵێت.

کاتێ خاڵۆژنی پرسیاری لێ کرد ئاخۆ دەیەوێ لەگەڵیـــدا بـــۆ قەســـابخانەکە بێـــت، میکوێـــل

تێگەییشت، ئەو بە ئەنقەست دەیەوێ هەمان شت بکات، کە دایک دەیکرد، ترسا لەوێ بیناسنەوە، ئەو کـوڕە گەنـجە بناسـنەوە، کە بـراکەی بـۆ سـەربازی دەڕۆیشـت و ئیـدی پاشـان بە پرسـیار لەبـارەی دایکیـیەوە دایـدەگرنەوە. هەر هـیچ نەیدەزانی دەبێ چی بڵێت. ئەو خەونەی کە ئێستا ئەو تیایدا بەشدار دەبوو، دونیایەک بە نۆرەگرتن و قەرەبـاڵخیی و مێـزی شتفرۆشـییەکانییەوە، وا دەردەکەوت لەمیانەی خودی گەرموگوڕییەکەیەوە، ئەو ئەگەرە بسـڕێتەوە، کە تاریکییەکـانی ڕۆژانـی جاران، دەکرێ هەڵگری مانـایەک بن کە تەنـانەت نـاتوانرێ چ ناویـان لـێ بنـرێ. بە خـاڵۆژنی گـوت نـایەوێ لەگەڵیـدا بـۆ قەسـابخانەکە بێـت، بەڵام دەتـوانن بەو شێوەیەی لەگەڵ بـاوک و خـاڵۆدا لە سەری ڕێک کەوتوون، یەکتر ببیننەوە.

کـاتێ لەبەر دوکـانەکەدا ڕاوەسـتان، خـاڵۆژن پرسی:" چی ڕوویدا؟"

میکوێل وتی: " نازانین. دایکم بە ئاراستەی پالووسا بە ڕێ کەوت".

خالۆژن بە بێزارییەوە هەناسەی هەڵکێشا.

وتی:

- ئەوە هەموو شتێک بوو؟

نیگای بڕندانە و شیکایەتکەرانە بوو. پرسی: "ملی نا بە بێ هۆ و لە ڕۆژێکی کرێوەی زستانیشدا؟".

میکوێل سەری لەقاند.

خالۆژن وتی: "بەهەرحاڵ... ئەو نەگەیشتووەتە جێ".

میکوێل وەڵامیدایەوە: "نازانم چۆن بتوانین بەبێ ئەو دەرەقەت بێین".

میکوێل دەیزانی بەو جۆرە بەر بە هەموو پرسیارەکانی دواتری خالۆژنی دەگرێ، بەڵام وتنی ئەوە بە تۆنێکی غەمگینی وا کە تەنها بۆ ئەوەی ڕێگەی درێژەپێدانی قسە و کونجکاویی لێ بگرێ،

کاریگەرییەکی دراماتیکی لەسەر دانا و سەرنجی دا وا خەریکە کوڵی گریانی بەردەبێ. ئاوڕی دایەوە و ڕۆیشت، دەستی لەسەر دەموچاوی دانابوو تا کەس فرمێسکەکانی نەبینێ. کە ڕۆیشت ئاوڕی بۆ دواوە نەدایەوە.

دواتر کاتێک بۆ قاوەخانەکە هات، هێشتا باوک و خاڵۆی نەهاتبوون. خاڵۆژنی بە ساردوسڕیی سڵاوی کرد. میکوێل بابۆڵەیەکی داوا کرد و کاتێ بۆی هات، خۆی جەڕاند تا دەسبەجێ نەیخوات، بەڵکو بە چەند پاروویەک بیخوات. کاتێ لە خواردنەکەی بۆوە، ئارەزوویەکی نائومێدانەی بۆ خواردنی بابۆڵەیەکی تر تێدا جووڵا.

کاتێ هاوڕێکەی خاڵۆژنی پەیدا بوو و دانیشت، بە مڵومۆوە تەماشای میکوێلی دەکرد.

وتی:" کە پێشتر تۆم بینی چاوم بڕوای نەدەکرد. لەگەڵ باپیرتدا دەڵێی سێوێکن و کراون بە دوو لەتەوە، کوڕە لە سێویش زیاتر، هەر

جـوولّەیەک دەکەیـت هەر ڕێـک دەڵێـی ئەویـت، تەنانەت لەوەشدا کە ئێستا تەماشام دەکەیت".

خالۆژن دەستوبرد وتی:" کاتێ ناسیم ئەو پیر بـوو. بەڵام لە یـادمە هەمـووان وایـان دەگـوت. تەنـانەت تـۆیش کە منـاڵ بوویـت، شـتگەلێکت دەکـردن، کە وای لە دایکـت دەکـرد ئەوەی وەبیـر بێتەوە".

میکوێل وتی: "من قەت نەمدیوە".

ژنەکە وتـــی: "وەک ئەوە وایە تارماییەکـــت بینیبێ".

میکوێـل وتـی: "ئەو قەت هیچـی لەو بـارەیەوە نەگوتووە".

ژنەکە درێـــژەی بە قســـەکانی دا: "لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر شـووەکەم لێـرە بـوایە ئەوا سـەری سـوڕ دەمـا، تەنـانەت لەوەی چـۆن ئێسـتا ڕووت لەسـەر مـن بە لایەکـی تـردا وەردەگێڕیـت، سـەری سووڕ دەما".

خالۆژن وتی: "ئێمە هەموومان دەچینەوە سەر یەکێک لە خێزانەکە. هەڵبەت ئەوەش شتێکی سروشتییە".

کاتێ دواجار باوک و خالۆ هاتنەوە، میکوێل بە ئاشکرا سەرنجی دا ئەوان بە بێدەنگیی لە بنکە پۆلیس هاتوونەتە دەرەوە. هەروەها میکوێل مەزەندەی ئەوەشی کرد باوکی پرسیارگەلێکی لێ کراون، کە بێ ئەندازە پێیان ناڕەحەت بووە. کاتێ دانیشت نەیتوانی تەماشای هیچ کامیان بکات.

ئەوسا خالۆ کەوتە باسی ئەوەی پۆلیس گەڕانێکی چڕوپڕ لە هەردوو گوندەوە دەست پێ دەکەن، لەو گوندەی کە دایک لێوەی کەوتۆتە ڕێ و لەو گوندەش کە بەڕێوە بووە بۆی. وتی پۆلیس هیچ پاساوێکیان بۆ ئەوە نەبینیوە خێزانەکەی یان گوندنشینان بەشداری لە بەدوادا گەڕاندا بکەن، چونکە ئەوە قۆرتی زیاتر دروست دەکات. بە دوادا گەڕانەکە لە سبەینێ و هەر لە کازیوەوە دەست

پێ دەکات، ئەگەرچی بە بڕوای ئەو دەبوو دوو ڕۆژ پێشتر دەستی پێ کردبا، بەڵام ئیتر چار چییە ئەوە نەبێ کە ئومێد بخوازرێ هەوڵەکان بوومیان هەبێت. میکوێل تا ڕادەیەک زەردەخەنەی هاتێ کاتێ تێبینی کرد، کە خاڵۆی وەک پۆلیس قسان دەکات.

که دوای سەفەرێکی خاووخلیچک بە ڕێگەی شەختەبەنددا، لەگەڵ باوکیدا بۆ ماڵەوە گەڕانەوە — جێبەکە گا دەچەقی و گا لە هەموو هەورازەکاندا کۆنترۆڵی نەدەما و لە چەند لۆفەیەکدا بەدبوومانە دەخزیی — دونیا تا ڕادەیەک تاریکی کردبوو. میکوێل یەکەمجار ئەو سێ جێبەی نەناسینەوە، کە لەبەر ماڵەوەیاندا ڕاوەستابوون. هەموو ئەو شتانەی ڕوویاندابوو هێند چاوەڕواننەکراو بوون، کە ئیدی ئەو سێ جێبە بۆ ئەو هیچ مانایەکیان نەدەگەیاند و بە حاڵ ئەوەی دەهێنا هیچیان لەبارەوە بگوترێ. پاشان بینی

ئەوانە جێبــــی پۆلیســــن، لەلای دەرگەکەوە دوو پــۆلیس ڕاوەســتابوون، کە بە دیــقەتەوە ســەرنجی ئەمانیــان دەدا کــاتێ بە جێــبەکەوە بەرەو لایــان دەچوون، میکوێـل پێیوابـوو پۆلیسـەکان ئەمانیـان ناسـیونەتەوە و چـاوەڕێی گەڕانەوەیـان کـردوون. میکویــل لەوەوبەر هــیچ کــام لەو پۆلیســانەی نەبینیبـوون. کـاتێ بە پــێ بەرەو دەرگەکە هـاتن، ســەریان لەقانــد، بەڵام هیچیــان نەگــوت. هـاتنە مــاڵەوە. لە مــوبەق، لەســەر کورســییەکی نزیــک پەنجەرەکە، ئەو پۆلیســە جـاحێڵە دانیشـتبوو، کە ڕۆژی دوای بزربوونی دایکی، هاتبوو. کاتێ میکوێل گڵــۆپی مــوبەقەکەی داگیرســاند، قــڵافەتە بــێ دەربەستەکەی هیچ گۆڕانکارییەکی بەسەردا نەهات.

کاتێ پۆلیسـە بە تەمەنتـرەکە هـاتە خـوارەوە، ئەو پۆلیسەی پێشتر بۆ ماڵەوە هـاتبوو، پەیامیـدا مـاڵەکە و پشـتیرەکانی خوارەوەیـان پشـکنیون. گوێیـان لە تەپەی پـۆتینی قـورس لەسـەر زەوییە

تەختەییەکەی سەرەوە بووە. میکوێل تەکانێکی دایە بەر خۆی تا هەستێ، بەڵام پۆلیسە بە تەمەنترەکە لە ڕێگەکەدا ڕاوەستا.

وتی: "نا، نا، بێ زەحمەت هەردووکتان لێرە لە خوارەوە دانیشن".

باوک لە فیکرەوە چوو: "پێتانوایە لە سەرەوە چی دەدۆزنەوە؟".

پۆلیسەکە دووبارەی کردەوە: "هەردووکتان لێرە لە خوارەوە دانیشن". وایوت و سەری بۆ پۆلیسە گەنجەکە لەقاند کە هەستایە سەر پێ وەک ئەوەی بیەوێ چاودێری پێپلیکانەکە بکات. میکوێل سەرنجیدا لە چاو جاری پێشوودا، نیگای پۆلیسە گەنجەکە تەمەبەڵانەتر و قژی کەمتر بریقەدار بوو. بە بێباکییەکی تەواوەوە وەڵامی نیگاکەی میکوێلی دایەوە، تەماشای ئەوی کردەوە بەبێ ئەوەی بە هیچ شێوەیەک وا بنوێنێ ئەوە دەبینێ کە سەیری دەکات. یەک تاقە جاریش

تەماشای باوکی میکوێلی نەکرد، کە کورسییەکی هێنابووە لای مێزی موبەقەکە و لەسەری دانیشتبوو.

کاتێ پۆلیسە بە تەمەنترەکە لە ماڵ چووە دەرەوە، تەقەوڕەقە لە یەکێک لە پشتیرەکانەوە هات. میکوێل مەزەندەی کرد ئەوە یەکێک لە دەرگە گەورە کۆنەکان بێ کە کراوەتەوە. بەرەو لای پەنجەرەکە ڕۆیشت تا ببینێ بزانێ حاڵ و مەسەلە چییە، بەڵام پۆلیسە گەنجەکە بەبێ ئەوەی هیچ بڵێ، بە ئارامی دەستی هەڵبڕی تا میکوێل لە شوێنی خۆی دانیشێتەوە.

باوکی میکوێل وتی: "ئەرێ ئێمە دەستبەسەر کراوین؟".

پۆلیسەکە تەماشای نەکرد و وەڵامی نەدایەوە. نیگای لەسەر میکوێل ڕاگرت و پاشان لەسەر باوک، ژێستی هیچ ناحەزیی و دوژمنایەتییەکی نەدەگەیاند، بەڵکو بە شێوەیەکی سەخت بەتاڵ لە

دەربڕین بوو. لە نەجووڵانە تەواوەتییەکەیدا، ڕوخساری، شێوەی کرمێکی سپی قەڵەوی هەبوو. هێشتا هیچی پێ نەوتبوون، کەچی دەنگی، شێوەزاری قسەکردنەکەی، شتی زۆریان لەبارەیەوە دەدرکاند. میکوێل هیچ نیگەران نەبوو لەوەی ڕێگەی لێ گیرا بەرەو لای پەنجەرەکە بچێت، ئەو دەیزانی خۆی و باوکی دەستبەسەر نەکراون، بەڵکو گەڕان و پشکنینی ماڵ و پشتیرەکان شتێکی ڕۆتینییە و بۆی هەیە بەهۆی لە زمانەوەدانی فۆیکس و کاستالیت — ەوە بێ. پێیوابوو پۆلیسە گەنجەکە بۆیە ڕێی لێ گرتووە بچێتە پێشەوە، لەبەرئەوەی نادڵنیا بووە: ڕاستتر لەبەر ترس لە بەرپرسیارێتییەکەی بووە وەک لەوەی خۆی بڕیاری ئەوەی دابێت. لە کاتێکدا کە ئەو سیانە لەوێدا بوون، باوک لەسەر کورسییەک و بە نیگایەکی غەمگینەوە کروشکەی کردبوو، میکوێل و پۆلیسەکە نیگایان لە نیگای گیر دەبوو

و پاشان لە دووریان دەنۆڕی، پاشان دوای ساتێک هەمدیس بە تیلەی چاو تەماشای یەکتریان دەکردەوە. میکوێل لێ گەڕا نیگای بە جەستەی پۆلیسە گەنجەکەدا هەڵنۆڕێ. پۆلیسە گەنجەکە بە تێکەڵەیەک لەنێوان حەز لێ بوون و بێ باکییدا تێبینی ئەوەی کردبوو، تا کاتێک میکوێل هەستا و سەرلەنوێ بەرەو لای پەنجەرەکە چوو. پۆلیسەکە شانی هەڵتەکاند و ئەمجارەیان ڕێگەی لێ نەگرت.

میکوێل بینی ئەو حەوت هەشت پۆلیسەی ئێستا لەبەردەم ماڵەکەدا کۆببوونەوە، فویکس و کاستالێت- یان لەگەڵدا بوو. هەڵبەت بۆی ساغ نەدەبۆوە ئاخۆ لە کام ئاراستەوە هاتوون ئەگەر ئەوانیش لە پشتیرەکان نەبووبن. جلکە مەدەنییەکەیان هەر هیچ نەیدەتوانی لەو دەستڕۆییشتوویییەیان کەم بکاتەوە، کە هەوڵیان دەدا لەنێو پۆلیسەکاندا، کە هەر هەموویان لە دەرەوە هاتبوون، کەم بکاتەوە. ئەوان بە وردی

گوێیان ڕادێرابوو لە کاتێکدا فویکس قسانی دەکرد و قلافەتی دەنواند. باوکی میکوێل هات بۆ لای پەنجەرەکە و ئەویش تەماشای کردن، بەڵام لەبەرئەوەی ئەم لە لا سێو نەیبینبوون، بۆیە تەنها میکوێل دەیزانی ئەوە مانای چییە کە ئەوان لەگەڵ پۆلیسەکاندا لەبەر دەرگەکە ڕاوەستاون. میکوێل لە خەیاڵی ئەوەدا بوو دەبێ چییان وتبێ کە ئاوها پۆلیس متمانەی پێ کردوون. کاتێ دواجار پۆلیسە گەنجەکە بۆ لای ئەوانی تر بانگ کرا، بەبێ هیچ قسەیەک ماڵەکەی جێهێشت و سێ جێبەکە کەوتنە ڕێ، هاوکاتیش فویکس و کاستالیت بە هێواشی بە بەفرەکەدا ڕۆیشتن.

ئێستا ئەو و باوکی بە تەنیا بوون. میکوێل لەو باوەڕەدا نەبوو لەوەودوا هیچ کام لە هاوسێکان خۆیان دەرخەن، ئاخر ئەوان چیدی لە بەدواداگەڕان لە چیاکاندا کە پۆلیس ئەنجامی دەدا، پێویست نەبوون. سەرلەنوێ کەوتە سەر

خەیاڵی ئەوەی پێویستە نامە بۆ جوردی بنووسن، بەڵام ئێستا دەبوو نامەکە ناوەڕۆکێک لە خۆ بگرێ کە تا ئێستا ئەو و باوکی نەیانتوانیوە بە یەکتری بڵێن. ئەو دەیزانی جوردی، گەر نامەیەکی ئاوهای پێ بگات، پێویستە سەفەر بۆ ماڵەوە بکاتەوە جا مۆڵەتی بدەنێ یان نا. بەڵام ئەگەر مۆڵەتیشی بدەنێ، ئەوا تەنها مۆڵەتێکی چەند ڕۆژیی دەبێ. میکوێل هێنایە بەرچاوی خۆی، کە جوردی چۆن لە پێناوی هیچدا بۆ ماڵەوە دەگەڕێتەوە، بۆ ماڵێکی چۆڵ دەگەڕێتەوە، بۆ لای کەمدوویی باوک، هیچ شتێک نییە بیکات، قەبرێک نییە سەردانی بکات، تەرمێک نییە دەستی تێوە بدات، تابووتێک نییە شان بنێتە ژێری، چ وشەیەک نییە سەرەخۆشیی پێ بکا. تەنها دیمەنێکی بەستەڵەک و ڕۆژانێکی ترسناک بەبێ چ هەوایەک کە ئەو شەختەبەندە بتوێنێتەوە.

میکوێل نەیدەتوانی بیهێنێتە بەرچاوی خۆی کە جوردی کاردانەوەی بەرامبەر نامەیەکی لەو جۆرە چۆن دەبێ، هەوڵی دەدا بیهێنێتە بەرچاوی چۆن دەیخوێنێتەوە و پاشان لەو جێگەیەوە کە لێیەتی، بە پەلە ڕێگەی ماڵەوە دەگرێتە بەر. لە هەموو ژیانیدا، هەر لەو کاتەی بچووک بووە، جوردی زەندەقی دەچوو کاتێ پشیلەیەکی بریندار، یان سەگێکی شەل، یاخود جۆرە ئاژەڵێکی برسی دەبینی. لەمیانەی هەموو تافی منداڵێتییدا، دایک و باوکی ناچار بوون ڕێگە نەدەن چاوی بە سەگی بەرەڵا یان پشیلەکانی دەرودراوسێ بکەوێ. کاتێ ڕاوچییەکان لە دارستان دەبوون و بەرازە کێوییان دەپێکا و پاشان بە لاشەی خوێناوییەوە بە گونددا ڕایاندەکێشان، جوردی لە ماڵەوە دەهێڵرایەوە. کە دوور دەکەوتەوە بیری کلوا - ی دەکرد، شتێک کە میکوێل و باوکی زۆر بە باشیی لە قەرەی دەهاتن، کە دوور دەکەوتەوە بە هەمان شێوە بیری

یەکێکیانی دەکرد. ئەگەری ئەوەی کە دایکی لەوانە بێ، مردبێ یان لە مەترسیدا بێت، بۆ جوردی شتێکی فرە دژوار دەبوو: هەواڵی ئەوەی کە دایکی بزر بووە، لە شوێنێکی زۆر دوورە، قووڵ لە بن بەفردایە، نەدەکرا لە ئێستادا پێی ڕابگەیەنرێ. هاوکاتیش میکوێل تێدەگەییشت ئەگەر ئەوان ئەمەی بۆ نەگێڕنەوە و لێگەڕێن بۆ خۆی بژی وەک ئەوەی هەرگیز هیچ ڕووی نەدابێ، ئەوا ئەوە شتێکە هەر تەواو خیانەتە.

لە کاتی نان خواردندا لە دەرگە درا و باوک و کوڕ ساوگەرتییانە لە یەکدییان نۆڕی. میکوێل دەرگەکەی کردەوە و جوزیف بێرناتی بینی پاکەتێکی بە دەستەوە بوو. لەمیانەی هەر دوو ڕۆژی بە دوادا گەڕانەکەدا، بێرناتیان لەگەڵدا بوو بەڵام لە دواوە خۆی دەهێشتەوە و بە حاڵ هەست بە ئامادبوونی دەکرا. وتی نایەوێ بێتە ژوورەوە، بەڵام ژنەکەی نانی کردووە و هەندێک شتی تریشی

لە دۆڵابی خۆراکمەنییەکەی هێناوە، کە هیوادارە بە دڵیان بێت. وایگوت و نووشتایەوە و بە هەمان خێرایی سوپاسکردنەکەی میکوێل، ئەمیش ڕۆیشت.

بێرنات کەوتە ئەوەی ئێواران سەردانیان بکات، زۆرجار تونگەیەک شیر، یان خواردەمەنییەکی تری تازەی لەگەڵ خۆیدا دەهێنا، ئەوەش زیاتر وەک بیانوویەک بوو بۆ دیدەنی کردنیان. میکوێل وردە وردە بە تەنیا دەچووە دەرەوە، هەندێجار دەیوێرا و تا ئەودیو سانتا ماگدەلێنا و ئەولاتریش بەرەو ڕێگە سەربازییەکە دەڕۆیشت، کە لە سەرما تەزێنەرەکەی ئەوێدا بەفر ببووە شەختە و لەوێ بنیادەم دەبوو بە وریاییەوە هەنگاو هەڵێنێ، بێرناتیش زۆر ڕاوێژ و بیرۆکەی نایابی هەبوون دەبوو ئەو گوێی بۆ ڕادێرێ. ئاخر بێرنارت هەر لە شەڕی ناوخۆوە یەکە بەیەکی مردنەکانی لە ناوچەکەدا لە یادبوون و بە تایبەتییش خۆکوشتن

و ڕووداوەکـــانی قەزاوقەدەر. یەکێـــک لە بـــابەتە لەبەردڵانەکانی بێرنات، بەسەرهاتەکەی لا سـینیۆرا فلیوڤیا بـوو، هێشـتا مێـردەکەی لە ژیانـدا مـابوو، بەڵام خۆی دەیان ساڵ لەوەوبەر هەڵدێررابووە نـاو بەفـرەوە. وتـی خێـزانەکەی بـۆ مـاوەی دوو مانـگ هەموو ڕۆژێک بە لای ئەو شوێنەدا تێپەڕیبوون، کە ئەوی لە بنـدا ڕاکشـابوو، بەڵام ئەو بە ژێـر کەرتە بەفرێکەوە ببوو، کە هەتاو قەت لێی نەدەدا، ئیتـر ئاوا لەوێدا مابۆوە تا هەموو شـتێک توابـۆوە. یـان ئەو کە هاوســەرگیریی لەگەڵ ئەو ژنە ئینگلیــزەدا کردبوو کە نیگارکێش بوو — لە نزیک پالووسـا وە بە جێبەکەیەوە وەرگەڕا و منداڵێکیشی کوشت.

ئێوارەیەکیان وتـی: " بە داخەوە ئێوە یەکەم ڕۆژ بە جێبەکەتـــانەوە نەهـــاتن، ئەگینـــا ڕەنـــگ بـــوو بدۆزرایەتەوە".

باوکی میکوێل سەری لەقاند.

میکوێل زۆر حەزی دەکرد بزانێ ئاخۆ بێرنات لە ناوەوەیڕا ڕای وایە دایکی لە کوێیە یان چۆن و کەی دەدۆزرێتەوە، بەڵام ئەو چ وەڵامێکی ڕوونی نەدەدایەوە. ئێوارەیەکیان کاتێ بێرنات هات بۆ لایان، میکوێل گوێی لە حەکایەتەکانی ڕادەدێرا و پاشان هەوڵیدا قسەوباسەکان بەلای تـوانەوەی خێرای بەفردا ببات، لەبارەی ئەوەوە ئاخۆ ئەو توانەوەی خێرای بەفرە بۆ دایکی خراپ نییە، لەبەرئەوەی دۆزینەوەی ئاڵۆز دەکات، چونکە دەشێت لاشەکەی ببێتە ئامانجی تەیر و ئاژەڵان بەرلەوەی ئەمان پیایدا ڕابگەن خۆیانی بگەیەننێ. بێرنات قسەکەی سەلماند و لە فیکرەوە چوو، چاوەڕێی کرد تا باوک لە ژوورەکە چووە دەرەوە، ئەوسا وتی مادامەکی پۆلیس نەیاندۆزیوەتەوە و بە وردییش بە دوایدا گەڕاون، ئەوسا بە بڕوای ئەو ناکرێ بەر لە توانەوەی بەفر لە بەهاردا، بەر لەوەی ڕێک هەموو بەفر و بەستەڵەکی ئەو

نـــــاوچەیە بە ئەرزەوە نەمێنـــــێ، تەرمەکەی بدۆزرێتەوە. وتی ئەوسا دەبێ بە درێژایی ڕۆژ چاو بە ئاسـمـاندا بگێـڕن، ئەگەر داڵە لاشـەخۆرەیان بینـی، ئەوسـا دەبـێ دەسـبەجێ خۆیـان هەڵـدەنە جێبەکەوە و بە پەلە خۆیان بگەیەننە ئەو شوێنەی کە ئەوان بە سەرییەوە دەسووڕێنەوە. وتـی ئیـدی بەو چەشنە، دەتوانرێ بدۆزرێتەوە.



کەسیان نەیاندەتوانی خواردن دروست بکەن. باوک هەوڵی نەدەدا و بۆڵەبۆڵیشی لە مۆنۆتۆنیی سیستمی خواردنەکە بوو. دەیوت:" ئەرێ هێلکە بوو بەچی، بوو بە چیی ڕانە بەراز. میکوێل هەوڵی دەدا برنج لێ بنێ، بەڵام بڵ و ڕەق دەردەچوو، نەیدەزانی ئاخۆ ئاوی کەم تێ کردووە، یان زۆر. کە پەتاتەی دەکوڵاند لە ئاوەکەدا دەبووە پرپۆڵە، بۆ نانیش، ئەوە بە نانەکانی بێرنات ڕاهاتبوون. نەیدەزانی ئاخۆ دایکی گۆشتی بۆ خۆرشت لە کوێوە دەهێنا بەبێ ئەوەی دوکان، یان ڕاسپاردگەیەک لە گوندەکەدا هەبێ، چۆن

توانیویەتی ژەمە خۆراکی جۆراوجۆر لێ بنێ. کاتێ هەوڵیدا نیسک لێ بنێ، باوکی ڕێک قابلەمە نیسکێنە گەرمەکەی هەڵڕژتە ئەو سەتڵەوە، کە بەرماوەی خواردنیان بۆ مریشکەکان تێ دەکرد.

ورده ورده و بەڵام بە شێوەیەکی ئاشکرا، مریشکەکان هێلکەیان کەمتر دەکرد، پاشان کەروێشکەکان بە کاوەخۆ دەمردن. میکوێل دەیزانی ئەو لە یەکەمین ڕۆژەکانی دیارنەمانی دایکیدا، کەروێشکەکانی پشتگوێ خستبوون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زوو بە زوو لەسەر خۆراکدانی مریشک و کەروێشکەکان ڕاهات، بەڵام ئەوان هەر سەرحاڵ نەبوون. کاتێ گومانی برد پیسوپۆخڵیی کەڵەکەبووی ناو کولانەکە بووەتە هۆکاری ئەوەی مریشکەکان هێلکە کەمتر بکەن، ڕۆژێکی بۆ پاککردنەوەی کولانەکە تەرخان کرد، بەڵام کاتێ توێکڵەهێلکەی لەناو کولانەکەدا بینی، ئەوسا کەوتە خایلەی ئەوەی بڵێی مریشکەکان هەر بە

ڕاستی هێلکەکانی خۆیان بخۆن. حەزی دەکرد کەسێکی لە گوند شک بردبا بیتوانیبا بچێت بۆ لای و پرسیاری لێ کردبا، بەڵام دەیزانی باوکی لە دژی دەوەستێتەوە گەر نیگەرانییەکانی خۆی تەنانەت بۆ بێرناتیش بەرهەڵدا بکات.

کەروێشکەکان دەمردن و میکوێل سەرنجی دەدا ئەگەرچی یەکێکیان لە قەفەزەکەدا، بە لاشەیەکی بێ جووڵە و بێ عەمەلەوە و بە چاوانێکی زەقەوە کەوتووە و لە خاڵێکی دووری نادیاری دەنۆڕێ، کەچی کەروێشکەکانی تر هەروەک ئەوەی هیچ نەبووبێ، خۆشحاڵ دەیاننواند و چەند ئاسایی ڕەفتاریان دەکرد. هەنووکە ئێستا ئەو کەروێشکە بە کەڵکی هیچ نەدەهات، چاڵێکی لەودیو پشتیرەکەوە بۆ هەڵکەند. میکوێل پێی خۆش نەبوو باوکی بزانێ کە سەرباری کێشە ئاشکراکانی خۆیان، کێشەی تریان لەماڵەوە هەن.

دوای مـــاوەیەک تەنهـــا کەروێشـــکە قـــاوەییە گەورەکـان مـابوونەوە، تـا کەروێشـکە سـپییەکان زیاتر بمردنیایە، قاوەییەکان قەڵەوتر و تەندروستتر دەبوون. میکوێل قەفەزەکانی پاک دەکردنەوە، کە باوک گوێی پێ نەدەدان. لەو سـەردەمەدا میکوێـل بەختـی دەبـوو گەر بەیانیـان تـاقە هێلکەیەکـی لە کولانەی مریشـکەکان ببینیـایە. لە خەیـاڵی ئەوەدا بـوو کە بـاوک پێیـوایە مریشـکەکان چیـدی هـێلکە نـاکەن لەبەرئەوەی لێیـان مانـدوو بووبـوو. هـیچ شتێک تامی لە زاری باوکدا نەدەدا. خۆی لەسـەر خـواردنی هەمـی دوکەڵـدراو بە نـان و تەمـاتە و زەیـتەوە ڕاهێنـا، ئەوەشـی لە کـاتی ژەمەکانـدا نەدەخـوارد، بەڵکـو لەو کاتـانەدا، کە هەسـتی بە برسێتیی بکردایە، قەراغی نانەکانیشی نەدەخوارد، بەڵکـو لەسـەر مێـزەکە دەیهێشـتنەوە تـا دواتـر میکوێل بیانداتە کلوا.

ڕۆژێکیان هات بۆ موبەق، لەوکاتەدا میکوێل کۆرڤێکی بە لۆبیاوە دەخوارد، کە ژنەکەی بێرنات بۆی ناردبوو.

وتی: "سبەینێ دەچم بۆ لا سێو. بە نیازم هەندێک کەروێشک و نەختێک هێلکەش لەگەڵ خۆمدا ببەم و بیانفرۆشم".

میکوێل بە نیگەرانییەوە تەماشای کرد.

- کەروێشکەکان هەر بەوەدا دەگەن بمرن. نازانم چۆن بەر بە مردنیان بگرم. مریشکەکانیش لە هێلکە چوونەتەوە.

باوک پرسی: "چیت لێ کردوون؟".

- خۆ من ژن نیم. هیچ شتێکیان لێ نازانم.

- تۆ هیچ کەیبانوویەک نیت.

باوک وای گوت و داچۆڕاوانە لەبەر خۆیەوە پێکەنی. وتی: "وایە؟".

میکوێل وتی: "تۆ خۆت سەرپەرشتییان بکە".

باوک وەڵامی دایەوە: "نا، هیچ لە خەیاڵی ئەوەدا نیم. کەروێشکی مردارەوەبووە! کەس لە گوند هیچیان لەبارەوە نازانێ؟".

- نەء.

- باشە. ئێمەش هێلکەمان نییە.

- دانەیەک لە قاپی سەر تاقەکەدایە.

- دەکرێ هەڵیبگرین بۆ یادگاریی.

میکوێل لەگەڵ باوکیدا بۆ لا سێو نەچوو، دوو ڕۆژی لەسەر یەک هەوا خۆشی کردبوو، ئەوەش مانای ئەوە بوو بەشێکی بەفرەکە توابۆوە. دووربینەکەی هەڵگرت و بەیانی زوو بەو مەبەستە کەوتە ڕێ کە بە باشیی بەر لە سەعات دوازدە بگاتە سانتا مەگدالینا و پاشان بزانێ تا کوێی ڕێگە سەربازییەکە گەییشتووە، ئەوەشی دەزانی کە هێشتا لێرە و لەوێ لە بن بەفرێکی قووڵدایە. کاتێ هاتە بەر هەتاوەکە، گەرمی بۆوە، هەندێجار هێند گەرم کە ناچار دەبوو پاڵتۆکەی لەبەر دابکەنێ. لە

مــــاوەی ســـــەعاتێک، یــــان ئەو دەوروبەرەدا، هانکەهانـک بە ڕێـگە بـاریکەکەدا هەنگـاوی دەنـا. ئاگــایی لەبــارەی ئەوەی کە لە کـۆڵ هــاودەمیی کردنی بـاوک و چۆڵەوانیی سـارد و سێبەرئاسـای مــاڵەکە، کە نەبــوونی دایــک بە هەمــوو کــون و قــوژبنێکییەوە دیــاربوو، ببــۆوە، تــا ڕادەیەک بەختەوەری کردبوو. تاقە شتێک نیگەرانی دەکرد، ئەوە بوو کە ناچار بێ دواجـار بگەڕێتەوە، کـاتێ گەییشــتە ئەو ســنوورەی بەفرەلــووکە دروســتی کردبــوو. میکوێــل بــۆی دەرکەوت ڕێــگەگە بەرەو سانتا ماگدەلینا هەر زۆر زیـاتر لەوە دەستڕەسـتر بوو، کە هەر کەسێک لە گوند مەزەندەی کردبـوو. لێــرە و لەوێ بەفــر بە تەواوەتیــی توابــۆوە، بە دوربینەکەی چاوی دەگێڕا تا بزانـێ ئـاخۆ تێبینـی شـتێک ناکـات. هەسـتی کـرد دایکـی سـەبارەت بە وادەی ســـەفەرە نائومێــدانەکەی و ئەو ڕۆژەی کە تیایـدا سـەری خـۆی هەڵگرتـووە، چ بەدشانسـێک

بووه. پێیوابوو ئەگەر سەعاتێک پێشتر ڕۆیشتبا، ئەوا بەبێ چ گرفتێک دەگەیشتە پالووسا، خۆ ئەگەر سەعاتێک درەنگتریش بە ڕێ کەوتبا، ئەوا نەیدەتوانی لێرەوە ئەولاتر بڕوا و دەگەڕایەوە. دایک تەواوێک لە وادەیەکی هەڵەدا گیری کردووە و دەشێت لەژێر تەپۆڵکەیەک بەفر لە هەورازەکانی خوار ڕێگە سەربازییەکەوە ڕاکشابێ، شوێنێک کە ئەمیش چاوی پێدا گێڕاوە بەبێ ئەوەی جگە لە قەدی درەختێک کە لەو ڕووبەرە سپییەوە هاتبووە دەرێ، هیچی تری نەدەبینی.

لە فیکرەوە چوو، سەیرە تا ڕادەیەک هیچ بەفرێک لە ڕێگە سەربازییەکەدا نەتواوەتەوە. زوربەی شوێنەکان بە هەمان ڕادەی ئەو ڕێگەیەی کە هەر ئێستا پێیدا هات، هەتاو لێیان دەدات. بەڵام ڕێگە سەربازییەکە کراوە بوو بۆ با، خراپ لە چیاکەوە بڕدرابوو، لەهەردوو بەرییەوە نە درەخت هەبوو نە تەلان. جا ئیتر بەفر نزیکەی لە هەر

ئاراستەیەکییەوە بە باوە بارییبا، بەفرەلووکەی لەسەر ڕێگەکەدا دروست دەکرد، ئەو ڕێگەیە خەڵکانی نەدیوونەناس بە پەلەپڕوکێ و نەشارەزایی لە قەدی شاخەکە بڕیبوویان بەبێ ئەوەی ڕەچاوی زەوییەکە بکەن، یان زانیارییان لەبارەی ئەوەوە هەبێ کە لە زستاندا چی ڕوو دەدا. زوو بە زوو تێبینی کرد تا سەر ئەژنۆکانی لە بەفردایە و دەبوو هەر هەنگاوێک بە تەقەلاوە بنێ و پاشان تەقەلایەکی تریش بدات بۆ خۆ هێنانە دەر.

ئاوڕی دایەوە و بەنێو ئاراوی بەفردا کەوتە خۆ تا خۆی گەیاندەوە گوند. ئومێدەوار بوو باوک توانیبای شتێکی لەماڵەوە کردبا، تەنانەت گەر تەنها ئاگرێکیشی داگیرساندبا. میکوێل دەیزانی باوکی لە لا سیۆ وە دەگەڕێتەوە، بە خواردنێکی زۆر زۆر یان زۆر کەمەوە، بە کیلۆ گۆشتەوە، کە

ناتوانن هەڵیبگرن، یاخود تەنها بە هێندەی ژەمێک کۆرڤەوە.

باوک لە ماڵەوە نەبوو، ئەوەش شتێکی سەرسوڕهێنەر بوو لەبەرئەوەی هەر لە بەیانی شەبەقەوە کەوتبووە ڕێ و کاری هێندە زۆریشی لەوێ نەبوو. ڕەنگە هەمدیس چووبێتەوە لای پۆلیس، بەڵام تا ئەو شوێنەی میکوێل حاڵی دەبوو، ئەوە کەمتر ڕێی تێدەچوو. نانیان نەبوو، کەمێک پەتاتەی سوور کردەوە و ئەو هێلکەیەش، کە باوک حەزی دەکرد وەک یادگار هەڵیبگرێ، لە ڕۆند قرچاند و ئاگرێکیشی کردەوە. لەو دەمەدا کاتێ بیری لە دایکی دەکردەوە، هەستەکانی زرینگەیەکی کپیان لە گوناه تێدابوو، ئامادەییەکی کرۆژەر لە سینگدا کە تەنها دەیتوانی ئاگایانە بیر لە شتێکی تر بکاتەوە تا کۆنترۆڵی بکات، بەڵام هاسان و بە پێ دزکێ هەمدیس ئەو هەستە گەمارۆی دەدایەوە. هەنووکە گلەوگازندەی لە خۆی

هەبوو کە لەو ساڵانەی پێشوودا، قەت لە ڕۆژێکی ئاساییدا ئاوها نەهاتۆتە موبەق تەماشای دایکی بکات، کە چێشت لێ دەنێ، یان تەباخەکە دادەگیرسێنێ و ئامادەیی خۆی بۆ یارمەتیدانی پیشان نەداوە، یان کاتێ خەریکی ئیش بووە، هاودەمیی و دەمەتەقێیەکی لەگەڵ نەکردووە. ئەوەشی دەزانی دەبوو ڕۆژی بەر لە دیارنەمانەکەی، ئازاتر بووایە، دەبوو ئاگای لێی بووایە و بەڵێنی بدایە، کە ئەم خۆی قەرەبووی ئەو شتە دەکاتەوە، کە باوک ڕشتبووی. دەبوو باوک ناچار بکا لێ نەگەڕێ بە تەنها لە ژوورێکدا جێی بهێڵێ لەکاتێکدا کە ئەو پێویستی بە ئەلکهول بووە. دەیزانی ئەو ئەگەر ئازا بوایە و بیوێرایە ئەوە بکات، ئەوا دەیتوانی ڕێگە لە سەرهەڵگرتنی بگرێت.

درەنگی کردبوو کاتێ گوێی لە جێبەکە بوو لەبەردەم ماڵدا ڕاوەستا. بە درێژایی شەو

دانیشتبوو لە ئاگرەکەی دەنۆڕی، نیوەی کاتەکە خەونی بەوە دەبینی بکەوێتە ڕێ، وەک چۆن دایک لە ناکاوێکڕا ڕۆیشت، ئەمیش بڕوات، بەرەو لا سیۆ و پاشان بەرەو لێریدا، یان بەرشلۆنە، یاخود هێشتا هەر دوورتر بڕوا و قەت قەت نەگەڕێتەوە. پێیوابوو قەت قەت نەبینینەوەی براکەی، باجێکی گەورە بوو بەرامبەر ئەو ئازادییەی کە تازەکیی لێی بەهرەمەند دەبوو، بەڵام لەوانە بوو بیانتوانیبا لە جێگەیەک یەکتری ببیننەوە، لەوانەیە جوردی-ش سەری خۆی هەڵگرتبا. ئەودوای کاتەکەش، خۆی بیرلێکردنەوە لەو هەموو قەرزەوە خەریک کرد، کە ئومێدی دەخواست بیداتەوە، لە تاریکییدا با هەڵیدەگرت و پاشان بۆ ناو ناخی و هاوکاتیش جار لە دوای جار بە ئازاری بەرپرسیارێتی دیارنەمان و مردنی دایکییەوە دەتلایەوە.

دەنگگەلێک لە دەرەوە هاتنە گوێی و بەلایەوە سەیر بوو، کە باوکی کەسێکی لە گوند،

گەیاندووە. دەشێ بێرنات بێ کە ڕۆژ دوای ڕۆژ پێدەچوو باوک باشتر لەگەڵیدا پێکبێ. ڕەنگبێ هەر لە لا سیۆ-وە لەگەڵ خۆی سەری خستبێ، یان لە جێگەیەکی ترەوە هێنابێتییەوە. کاتێ گوێی لە تەپەی پێ بوو، کە بە ڕێگە بە بەفری تەنک پۆشراوەکەی دەرەوەی ماڵدا دەهات، ئەم نەجوولا. ئەگەر باوک پێویستی بە یارمەتی بووایە، کە شمەکی لە جێبەکەوە لەگەڵ داگرێ و بیهێنێتە ماڵەوە، ئەوا دەیتوانی خۆی بێت و داوا بکات. کاتێ باوک خۆی بە موبەقدا کرد، زەردەخەنەیەکی میهرەبانانە و گەرمی بە لێوەوە بوو. چەند کیسەیەکی پێ بوو، لە دوایەوە کوڕێکی گەنجی ڕەنگپەڕیو وەدیار کەوت، هێندەی میکوێل بەخۆ نەبوو، بەڵام بەهێز دەینواند، میکوێل مەزەندەی دەکرد تەمەنی هێشتا نەبووبێتە بیست ساڵان. ئەویش چەند کیسەیەکی هەڵگرتبوو. میکوێل پێیوابوو قەت لەوەوبەر ئەو کوڕەی نەبینیوە.

میکوێل ڕووی بەرەو لای ئاگرەکە وەرگێڕا وەک ئەوەی بە تەنها بێت، دوو کوتە داری لە زەمیلەکە هەڵگرت و فیڵبازانە خستنییە سەر تاقەکە.

باوک وتی: "برسیمانە، نانمان نەخواردووە. مانولو شێومان بۆ لێ دەنێت".

مانولو ئاوڕی بۆ میکوێل دایەوە کە هێور خۆی بە ئاگرەکەوە مەژوڵ کردبوو، بەبێ ئەوەی هیچ بڵێت.

میکوێل وتی: "من شێوم خواردووە، بەڵام بە تەمام کەمێک زیاتر بخۆم".

چاوانی مانولو ڕەش بوون، قژیشی ڕەشی قەترانیی. کەوتە کردنەوەی دۆڵابەکە، گەڕا تا ببینێ چی هەیە و چی نییە و پاشان هەموو شمەکی ناو کیسەکان، کە لە جێبەکەوە هێنابوویاننە ژوورەوە، خستە دۆڵابەکە.

لە کاتێکدا بەرکوڵێکی کۆرف و لۆبیایان بە نانی تازەوە کرد، دەرکەوت باوکی میکوێل چەند

هاوسێیەکی ژنبراکەی لە پالووسا بینیون و باسی دۆخی خەراپی خۆیانی بۆ کردوون. پێیگوتوون پێویستی بە کەسێکە کاروباری ماڵەکەیان بۆ ڕاپەڕێنێ، بەڵام لەو بڕوایەدا نییە چ کەسێک بدۆزێتەوە لەبەرئەوەی لە خانووەکەیاندا چ ژوورێک نییە بکرێ کچ یان ژنێکی لێ بنوێ و ئەوە هەر باسی ژنانی دەرودراوسێش مەکە چۆن لێیان دەخوێنن. خەڵکەکەی پالووسا بۆیان باس کردووە مانولو کە کوڕێکی بێ دایک و باوکە، هیچ ئیشێکی نییە، لەو کێڵگەیەی ئەو نزیکانە دەژی کە بەهار و هاوین ئیشی لێ دەکا، بەڵام زستانان چ شتێکی ئەوتۆ نییە بیکات. گوتبوویان ئەو دەتوانێ خۆی بۆ ڕاپەڕاندنی ئیشوکاری ماڵ تەرخان بکات و زیرەکیشە تیایدا، جگە لەوەش ئەوە بۆ ئەو کەسەش باشترە، کە ئێستا لەلای دەژی، لەبەرئەوەی ئەوسا خواردنی کەسێک کەمتر دەدات. باوکی میکوێل وتی ئیدی بڕیاری داوە

دەسبەجێ بەرەو پوولسا لێ بخوڕێ و لەوێ مانولو و خاوەنکارەکەی بینون و لەگەڵیدا ڕێک کەوتووە، کە هەر یەکسەر دەسبەرداری ببێت.

باوک وتی:" ئیتر بەو جۆرە جوان جوان لە جێبەکەدا بارم کرد. دەڵێ دەتوانێ چێشت لێ بنێ و ئێمەش هەر ئێستا ئەوەمان بۆ ساغ دەبێتەوە".

باوک پیلانگێرانە زەردەخەنەی ڕووە و مانولو هاتێ و ئەویش وەڵامی نەدایەوە، بەڵکو بە جیددی لە میکوێلی ڕوانی کە پێیوابوو چیرۆکەکەی باوکی لەبارەی دۆزینەوە و هێنانەوەیەوە، لەوە دەچێ ئاژەڵێک، یان کیسەیەک برنجی کڕیبێ، میکوێل مەزەندەی دەکرد مانولوش هەر وا تێگەییشتبێ کە هەرچی زیاتر ماتتر دەینواند و باوکیش کە لە مەزاجێکی بە کەیفدا بوو، ڕیز ڕیز قسانی دەکرد.

کاتێ لەسەر مێزەکە دانیشتن و کەوتنە نان خواردن، میکوێل پێیوابوو ئەم زۆر قسەی نەکردووە و بیری لەوە کردووە بڵێی ئەم قوڕوقەپ

لێ کردنەی، بۆ میوانە تازەکە شتێکی زەندەقبەر نەبێت.

وتی: "باوکم دەعبایەکە بۆ خۆی. تۆ هەڵەیەکی گەورەت کردووە کە لەگەڵیدا هاتوویت".

ئەو و باوکی کەوتنە پێکەنین، بەڵام کوڕەکە بێدەنگ دانیشتبوو، هەر چەند ئەوان زیاتر پێکەنیبان، ئەم زیاتر ماتتر دەبوو. هەر کە لە خواردنەکە بوونەوە، ئەو دەسبەجێ قاپەکانی کۆکردنەوە، مەنجەڵێک ئاوی خستە سەر تەباخەکە و کەوتە هەڵچنینی ئەو قاپوقاچاخانەی کە چەند ڕۆژێک بوو لەوێدا بوون. میکوێل شوێنی خۆی لای ئاگرەکەوە گرتەوە و باوکیش لای مێزەکەوە ڕاوەستا.

باوک پرسی: "سەرچەف و بەرگەدۆشەکمان هەن؟".

میکوێل شانی لەقاند. لەوەتەی دایک دیار نەمابوو ئەوان سەرچەف و بەرگەدۆشەکەکانیان

نەگۆڕیبوون. نەیدەزانی ئاخۆ دەبێ سەرچەف و بەرگەدۆشەکەکان بەر لە بەکارهێنانیان، لە نزیک ئاگرەکەوە هەڵبخرێن.

باوک وتی: "هەرچۆنێک بێ دۆشەکڵەی سەر تەختەخەوەکەی جوردی بە باشی بە هەوا دراوە".

میکوێل وتی: "دەتوانین بیگوێزینەوە بۆ کلوختەکە؟".

باوک وتی: "پەنجەرەکەی ئەوێ شکاوە. سەرمای دەبێ".

میکوێل وتی: "من حەز ناکەم لە ژوورەکەی مندا بێت".

مونولو. کە پشتی لێیان بوو، لە قاپ شتنەکەی وەستا. هەوڵیدا وا نەنوێنێ گوێی لە قسەکانیان نییە.

باوک وتی: "با شەو لای تۆ بنوێ. خۆم پیشانی دەدەم بەرگەنوێن و بەتانیی لە کوێیە. ئەو خۆی دەتوانێ ڕایانخات".

میکوێل هەناسەی هەڵکێشا و نیگای لەسەر ئاگرەکەی چڕکردەوە. کاتێ هەمدیس سەری هەڵبڕی، مانولوی بینی لای قوڵکەی قاپ شتن و تەباخەکەوە کەوتۆتە ئیش. کاتێ بە ژوورەکەدا هات تا مێزەکە بسڕێت، تەماشای میکوێلی نەکرد. ئەوسا کە کاتی ئەوە بوو میکوێل بۆ ژوورەی نووستن بچێت، باوک بەتانی و بەرگەنوێن و باڵشتەکانی پیشانی مانولو دابوو لە کوێدان و یارمەتی لە هەڵگرتنیاندا دا، کاتێ میکوێل چووە ژوورەوە، هەستی کرد ژوورەکە زۆر تەنگە. مانولو وردەکارانە هەموو بەتانییەکانی قەد دەکردن و ڕێکوپێک بەسەر تەختەخەوەکەدا ڕایدەخستن. کاتێ میکوێل هاتە ژوورەوە، ئاوڕی بۆ نەدایەوە، بەڵکو کاتێ ئاوڕی بۆ دایەوە کە دەرگەکە داخرا. سڵاوی نەکرد، تەنها بە کاروبارەکانی خۆیەوە خەریک بوو، میکوێل ڕاوەستا و سەرنجی دەدا، بەر

لەوەی خۆی بگۆڕێ، چاوەڕێی کرد تا لە خۆگۆڕین بۆوە.

مانولو لە جانتایەکی بچووکدا دەگەڕا و میکوێل لەسەر تەختەخەوەکەی ڕاکشا. تێگەییشت ئەو جانتایە، تاقە شتێکە کە مانولو لەگەڵ خۆیدا هێناویەتی. بە حاڵ جێگە بۆ خۆگۆڕین مابوو. کاتێ مانولو بلوزەکەی لەبەر داکەند، میکوێل سەرنجی دا کراسەکەی لە پشتەوە دڕاوە و لای سەرقۆڵ و ئێخەکەشییەوە سواوە. لە نهۆمی خوارەوە بۆنێک بەر کەپووی کەوتبوو، بۆنێکی گەنیو، کاتێ مانولو پێڵاوەکانی داکەند، ئەو بۆنە زیادی کردبوو. کاتێ مانولو پانتۆڵەکەی داکەند و بە پشتی کورسییەکدا هەڵیواسی، ئینجا میکوێل مەزەندەی کرد ئەو بۆنە لە گۆرەوییەکانییەوە بێت کە ئێستا خەریک بوو لە پێی دادەکەندن. گۆرەوییەکانی خستنە ژێر تەختەخەوەکە و

تەماشای میکوێلی کرد تا مۆڵەتی لێ بخوازێ گڵۆپ بکوژێننەوە.

میکوێل پرسی: "دەتوانیت پێڵاو و گۆرەوییەکانت لە دەرەوە دانێیت؟".

مانولو سەری لەقاند، هیچ ئاماژەیەکی پیشان نەدا ئەوەی پێ ناخۆش بێ، کاتێ بە دوای گۆرەوییەکاندا دانەوییەوە و پاشان بە ژوورەکەدا ڕۆیشت تا پێڵاوەکانی هەڵبگرێ، میکوێل حاڵی بوو، کە ئەو هیچ بیجامەیەکی پێ نییە و دەرپێی کورتیشی لە پێدا نییە. بە تەمابوو بە کراسەوە بنوێ. کاتێ پێڵاو و گۆرەوییەکانی لە دەرەوە دانان و دەرگەکەی داخست، گڵۆپەکەی کوژاندەوە و بە ژوورەکەدا هات. کەسیان کە لە تاریکییدا ڕاکشابوون، هیچیان نەگوت. میکوێل پێی وابوو مانوولو دەسبەجێ خەوی لێ کەوتووە.

هێنایە بەر چاوی خۆی چۆن نامە بۆ جوردی بنووسێ و بۆی باس بکات چی ڕووی داوە. بۆی

باس بکات دایکمان دیارنەماوە، مردووە و لەژێر بەستەڵەکدا ڕاکشاوە، کاتێ بەفر دەست بە تواندنەوە دەکات، دەبێ بە دوای داڵە لاشەخۆرەدا چاو بە ئاسماندا بگێڕین، تا بەر لەوەی ئەوان بیدۆزنەوە، ئێمە بیدۆزینەوە. لەسەر تەختەخەوەکەی تۆ کوڕێکی ڕەشتاڵە و بێدەنگ و مات دەنوێت، کە بە جلکی تەواوەوە نەهاتووە و حەز دەکات کاروباری ژنانەی ماڵ ڕاپەڕێنێ. هاتۆتە ژوورەکەی منەوە، گوێم لە هەناسەدانێتی کە سووک و ڕیتمیکە. سبەی زوو هەوڵ دەدەم شوێنێکی تری بۆ بدۆزمەوە تا بتوانێ لێی بنوێت.



هەموو ڕۆژێک چەندێک بیتوانیبا ڕێگەیەکی درێژی دەبڕی، بەفری ڕێگە سەربازییەکە کەوتبووە توانەوە و چەند بەشێکی ڕێگەی سانیا ماگدەلێناش وشک بوو. ئەو هەموو ڕۆژ لە وەخت و وادەی جیاجیادا دەڕۆیشت، ئەوە پێوەندی بەو ئیشوکارانەوە هەبوو کە دەبوو بیانکات، بەڵام زۆر جاران باوک و مانولو دەیانتوانی تەگبیری خۆیان بکەن. باوک لەو دەمەدا کەوتبووە ئیش و بەردی بۆ جوزیف بێرنارت دادەتاشی و ڕۆژ تا ئێوارە لە ماڵەوە نەدەبوو. مانولو سەخت ئیشی دەکرد، چێشتی لێ دەنا و قاپی دەشت و گسکی دەدا و

گەر پێویستیشی کردبا لە کاروباری ئاژەڵەکاندا، کۆمەکی دەکرد.

بەفر هەر لە تواندنەوەدا بوو، خاڵۆی میکوێل لە پالووساوە هات و بە جێبەکە لە گوندەوە چوو بۆ سانتا ماگدەلینا و لەوێشەوە لەگەڵ میکوێلدا بەرەو ڕێگە سەربازییەکە ڕۆیشتن، کە ئەگەرچی بەفر بە چڕیی لە دەوروبەریدا نیشتبوو، بەڵام ئێستا زوربەی ڕێگەکە بەفری پێوە نەمابوو. خاڵۆی چەند جارێک لە جێبەکە دابەزی و بە دووربینەکەی میکوێل تەماشای ئەو ناوەی کرد. کاتێ میکوێل بۆی باس کرد، کە بێرنات چی لەبارەی داڵە لاشەخۆرەکانەوە پێ وتووە، خاڵۆی قسەکەی سەلماند. وتی ناچارن چاوەڕێ بکەن و چاویان بۆ بگێڕن و ئومێدەواربن هەر لەگەڵ بەرزبوونەوەی پلەی گەرمادا، بیدۆزنەوە. وتی پێیوانییە هێشتا چ داڵە لاشەخۆرەیەک بە ئاسمانی پالووساوە وەدیارکەوتبێ، لە هیچ شوێنێکی تریشدا

کە لە "سۆرت" بەرزتر بێ، دەرنەکەوتووە. گەر بنیادەم بیانبینێ دەسوورێنەوە ئەوا ئیدی دەزانێ کە بەهار هەر بە ڕاستی هاتووە.

کاتێ فرانسێسک لە ماڵەوە لووتی بوو بە مانولو وە، لە باوەشی گرت و بە گەرمی سڵاوی لێ کرد. میکوێل کەوتە کەناری لەخۆدامانەوە و هاوکاتیش مانولو زەردەی دەهاتێ و لە بارەی خەڵک و ڕووداوەکانی پالووساوە پرسیاری لێ دەکرد. مانولو لەو کاتەوەی بۆ لای ئەمان هاتبوو، ئێستا لە هەر کاتێکی تر سەرزیندەتر دیاربوو.

لە دەرەوە، بەر لەوەی بە ڕێ بکەوێت، خاڵۆ بۆ میکوێلی گێڕایەوە کە باوکی مانولو لە کۆتایی جەنگدا و لەکاتێکدا دایکی دووگیان بووە، دەسگیر کراوە و گوللەباران کراوە. دایکی تەنها ساڵێکی تر ژیاوە، بە سیل مردووە و خاڵۆی پیێوابوو هەروەها لە غەمیشدا مردووە. مانولو لای پوورزاکانی باوکی بەخێو کراوە تا ئەو کاتەی دەستی ئیشی گرتووە

و پاشـــان لە کــێڵگە جیاوازەکـــانی دەورووبەری پالووسادا کاری کردووە، لە هەندێک جێگەدا خراپ مامەڵەی کراوە. خـاڵۆ وتـی داسـتانێکی هەر تەواو غەمهەژێـنە، لەبەرئەوەی بـاوکی مـانولو قەت بە حـاڵیش لە جەنـگەوە نەگـلاوە، تەنهـا مەسـەلەکە چارەڕەشیی خـۆی بـووە. هیـوای خواسـت مـانولو لێـرە لە چـاو هەنـدێ جـێگەی تـردا، خۆشـی لـێ بگوزەرێت. میکوێل بەو شێوازەی خاڵی قسانی پێ دەکـرد، تێگەییشـت دیـارە ئەم و مـانولو هێشـتا نەبوونەتە هاوڕێ. ئەو شەوە مانولو سوپاسگوزار و واقوڕمـاو دەینوانـد کـاتێ میکوێـل هەنـدێک لە جلوبەرگەکانی، چەنـد کـراس و دەرپـێ کـورت و جووتێـک پـۆتینی بە مـانولو بەخشـی و ئەویـش گفتی دا ئاگای لێیان بێ.

کەشوهەوا خەراپتر بووبوو، بەفرێکی نوێ باری و دوو شـــەو و ڕۆژ کرێـــوە خـــولی لە هەوادا بە بەفـرەکە، وەک ئەوەی تۆزوخـۆڵ بێـت، دەدا. هەر

کە بــاوک لەگەڵ میکوێلــدا ئاژەڵەکانیــان بەســەر
کردەوە، ڕۆیشت بۆ پشتیرەکەی بێرنات. بۆ فراوین
گەڕایەوە ماڵ و هەمدیس ڕۆیشتەوە. وا پێ دەچوو
بەو ئیشە نوێیە بەختەوەر بێ، گاڵتەی دەکرد و
کە لای مێزەکە دادەنیشت، لە خولقێکی خۆشدا
دەبوو.

لەو ڕۆژانەدا، کە میکوێل بەهۆی کەشوهەواوە
نەیدەتوانی لە دەرەوە ئیش بکات، لە موبەقەکە
دەمایەوە و هەوڵی دەدا لەگەڵ مانولو دا دەمودۆ
بکات و بزانێ لە کوێ خۆی فێری چێشت لێنان
کردووە و چیدەکات کاتێ ددانی مریشکەکان دەدا،
بەڵام وەڵامەکەی مانولو زیاتر ئەرکدارانە و کورت
بوو. دیاربوو مانولو حەزی نەدەکرد بدوێ. ئارام و
بە دیقەت ئیشی خۆی دەکرد و بە ژیستێکی
جیــــــددیانەوە بە مــــــاڵەکەدا دەگەڕا. بە
ئاگالێبوونەکانی ئەو، مریشکەکان وردە وردە، بەڵام
بە دڵنیــاییەوە هەمــدیس کەوتــنەوە هــێلکە و

کەروێشکەکان ئاهێکیان تێ گەڕایەوە. ئەگەرچی داوایان لێ دەکرد، بەڵام ئەم لەگەڵیان دانەدەنیشت، بەڵکو بە پێوە و لەلای تەباخەکەوە نانی دەخوارد و تا ئەوانیش لێ نەبوونایەتەوە، دەستی بە نان خواردن نەدەکرد. لەگەڵ ئەوەشدا کە میوکێل پێی دەگوت وا نەکات، کەچی ئەو هەموو شەوێک بەرلەوەی گڵۆپەکە بکوژێنێتەوە، پێڵاو و گۆرەوییەکانی لە دەرەوەی ژووری نووستنەکە دادەنان. تەماشای دەکرد بزانێ ئاخۆ کلوا شتی خواردووە، بەڵام میکوێل چەند جارێک تێبینی ئەوەی کرد، کە مانولو بەری بە کلوا دەگرت کاتێ دوای دەکەوت، یاخود دڵاوێزانە بازی بە سەردا دەدا.

باوکی میکوێل سوعبەتی لەگەڵ مانولو-دا دەکرد و پێیدەوت ئەگەر ببێتە ژنێکی خانومانی هەر پیاوێک، تاقە شتێک کە پێویستی پێ بێ، تەنوورەیەکە. باوک پێیدەوت ئیدی دەتوانێ

هاوینان بۆ هەموو ئاهەنگەکان بچێ و پاییزییش ڕێک بەرەو کڵێسا. کاتێ مانولو گوێی لەوە، یان لە هەر یەکێک لە پلارە زۆرەکانی تر دەبوو، قەت زەردەی نەدەهاتێ، بەڵکو هەر سەرقاڵی ئیشی خۆی دەبوو. وردە وردە ئەو پلار لێدانانە بووبووە یەکێک لە بابەتە دووبارەکانی باوک.

دەیوت: "بەڵام ئێمە دەبێ مشووری تەنوورەیەکت بۆ بخۆین. بۆ خۆت دەبیتە باشترین کەیبانووی سەرانسەری وڵات. باشتر لە هەر کیژێکی هاوتەمەنی خۆت. جاروبار وا دێت بە خەیاڵمدا کیژێکیان بۆ هەناردووین. دەشێ کچ بێت و وا خۆت بنوێنیت کە کوڕیت".

ڕۆژێکیان کاتێ باوک تامی تێدا نەهێشت کرد و لەمیانەی ژەمە خواردنێکدا، زیاد لە یەکێک لەو پلارانەی لێدا و ئیدی حاڵومەسەلە وەک تەنگپێهەڵچنینی لێهات، مانولو بەرەو لای مێزەکە ڕۆیشت و لەبەردەم باوکی میکوێل دا ڕاوەستا.

- گەر جارێکی تر وا بڵێیت، ئەوا ملی ڕێگە دەگرم و دەڕۆم.

باوک کورسیەکەی هێنایە دواوە و سەری هەڵبڕی و لە ڕوخساری مانولوی ڕوانی کە بە ئاشکرا لە جاران ڕەنگپەڕیوتر بوو.

باوک کەوتە قسان: "هیچ مەبەستم نەبوو کە... ".

مانولو وتی: "تێدەگەم مەبەستت چی بوو. ئەگەر جارێکی تر دووبارەی بکەیتەوە ئەوا ملی ڕێگە دەگرم و دەڕۆم".

- مەبەستم نەبوو بریندارت بکەم.

- کەواتە ئیتر دووبارەی مەکەرەوە.

باوک وتی: "ئایا لەبەرئەوەی کەمەکێک پڕڕوویی بە قسەکانمەوە دیاربوو؟".

مانولو بۆ لای تەباخەکە گەڕایەوە و پشتی تێ کردن. میکوێل بینی چۆن باوک جۆرە تەقەلایەکی ناوەکی بە خەرج دەدا و هەوڵی دەدا شێوازێک

بـدۆزێتەوە تـا شـتەکە ئاسـایی بکـاتەوە، بەڵام میکوێـل مەزەنـدەی کـرد مـانولو چ مەودایەکـی بە کراوەیی بۆ ئەوە نەهێشتبۆوە.

باوک لە مانولوی پرسـی: "ئێـرەت پـێ خـۆش نییە؟".

مانولو نە ئاوڕی دایەوە و نە هیچیشی گوت.

باوک وتـی: "پرسیارم لێ کردیت".

مانولو بەبێ ئەوەی ئاوڕ بـداتەوە وتـی: "ئیتـر ئەوە تەرک بکە، کە پێمبڵێی من کچم".

باوک وتـی: "من قەت پێمنەوتوویت تۆ کچیـت. کەی گوتـوومە تـۆ کچیـت؟ هەر بە ڕاسـتی کەی ئەوەم گوتووە؟"

مانولو وەڵامی نەدایەوە.

بـاوک پرسـی: "ئەرێ تـۆ کەڕیـت؟ کەی پـێم وتوویت تۆ کچیت؟".

میکوێـل تێبینـی کـرد مـانولو شـانی هێنـایەوە یەک وەک ئەوەی لەوەدابێ کوڵی گریـانی بەرببـێ.

هەستی بە بێ دەسەڵاتیی کرد، کە شێوازێک شک نابا بۆ دەستتێوەردان، خەیاڵی بەرەو هەراکەی بەر لەو ڕۆژە گەڕاندەوە کە دایکی سەری خۆی هەڵگرت و ڕۆیشت. کاتێ باوک هەستا، میکوێل هەستی کرد کە ئەو بەو بێدەنگییەی، نەیتوانیوە ببێتە شاهێدی ئەم ڤێرژێنە دڵڕەقانەیەی هەراکەی پێشوو.

بە باوکی گوت: "وازی لێ بێنە و دانیشە!".

دڵنیابوو باوک هیچ نەیدەزانی کە دەبێ چۆناوچۆنی ڕەفتار بکات. میکوێل خەریک بوو ئەوەش بۆ قسەکەی زیاد بکات و بە باوکی بڵێ ناخۆشت کردووە و ناڕەحەتیی زۆرت لەم ماڵەدا ناوەتەوە، بەڵام خۆشحاڵ بوو توانی ددان بە خۆیدا بگرێ. باوک بە ڕوانینێکی خەمگینەوە ڕاوەستاو و مانولوش هات تا قاپوقاچاخەکان کۆبکاتەوە هەروەک ئەوەی هیچ ڕووینەدابێ. میکوێل نەدەجوولا و سەرنجیدا باوک تەنانەت

هەناسەوەبەرهاتنەوەکەشی نەدەژنەوت. هەوڵیدا هیچ شتێک نەکات. دواجار، دوای ئەوەی هەناسەیەکی قووڵی هەڵمژت، باوک موبەقەکەی جێهێشت و بۆ سەر ئیشەکەی لەلای بێرنات گەڕایەوە. میکوێل زەردەی بۆ مانولو هاتێ کاتێ بۆ لای مێزەکە گەڕایەوە. ئەو زەردەخەنەیەی کە مانولو توانی وەڵامی پێ بداتەوە، لەوە ناوەکیی تر بوو نیوە پەنهان بێ و بە خێرایی نەڕەوێتەوە.

ئەو شەوە یەکەمینجار بوو مانولو لە ژووری نووستنەکە قسەی لەگەڵ میکوێل دا کرد. ئەوسا کە پێڵاو و گۆرەوەییەکانی لەودیو دەرگەی ژوورەکەوە داکەندن، گڵۆپەکەی کوژاندەوە، بە ژوورەکەدا هات و لەسەر تەختەخەوەکەی ڕاکشا.

وتی: "ناکرێ هەر ئاوها کرێوە بکا".

میکوێل وەڵامی دایەوە: "ڕۆژ بە ڕۆژ خراپتر دەبێت".

مانولو وتی: "تۆ زۆر جاران شـەوانە دەگریـت، بە بەرزیی و ئەو شتانە نا، بەڵام هەندێکجار گـوێم لێتە دەگریت".

میکوێل وتی: "نەمزانیوە".

مانولو پرسی: "خەونی مۆتەکاویی دەبینیت؟".

- تەواو نـا. زۆر جـاران خەون دەبیـنم بـراکەم لێرەیە و ئێمەش زۆر جاحێڵترین.

مانولو وتی: "ناقیژێنیت، بەڵام دەگریت. تەنهـا بۆ ساتێکی کەم".

- هەوڵ دەدەم ئەمجارە بێدەنگ بم.

- قەیدی ناکا.

ئەوسـا لەبـارەی دیارنەمـانی دایکـی میکوێـل و ئەوەوە، کە چۆن دەبێ بدۆزرێتەوە، قسانیان کرد. مانولو بە دەنگێکی نـزم دەدوا و پێـدەچوو زۆر بە دیـقەتەوە بیـر لە هەمـوو ئەو شـتانە بکـاتەوە کە دەیـوتن. میکوێـل گێـڕایەوە کە جـوردی هــیچ خەبەرێکـی لەبـارەی دیارنەمـانی دایکیـیەوە نیـیە.

ئەوان نامەیەکیان لێیەوە پێگەییشتووە و نووسیویەتی لە ڤالادولید-ە، باوکیش وەڵامی داوەتەوە کە هیچ شتێکی تازە لێرە ڕوویندەداوە. کاتێ مانولو هیچ وەڵامێکی ئەوەی نەدایەوە، میکوێل دەیزانی خەوی لێ نەکەوتووە، بەڵکو بیر لەو قسەیە دەکاتەوە کە گوێی لێ بووە.

دواجار وتی: "باوکت هەڵەیە".

میکوێل وتی: "دەزانم، بەڵام خۆم ناتوانم نامە بۆ جوردی بنووسم و بۆی بگێڕمەوە. ئەوە ئیشی من نییە. ئاخر چۆن دەتوانم لە نامەیەکدا ئەوەی ڕوویداوە، بینووسم؟".

مانولو هیچی نەگوت، بە شێوەی بێدەنگییەکەیدا، میکوێل تێگەییشت ئەو ڕای خۆی گوتووە. ڕاکشابوون و هیچیان نەدەگوت تا میکوێل تێبینی کرد مانولو خەو بردوویەتییەوە.

بۆ ساتێک دواتر ئەمیش نووست و پاشان بەهۆی باڕێزەکەوە وەئاگابۆوە. با بە جۆرێکی هێند

تووڕە و هەڕەشەئامێز دەیوژاند کە پێ دەچوو بە نیازی ئەوە بێت خانووەکە لە بناخەوە دەرکێشێ یان ساپیتەکە هەڵبگرێت، یاخود ڕێک پەنجەرەکە بشکێنێ و بێتە ژوورەوە و وەک بەرازەکێویی لە یەکە بە یەکەی ژووورەکاندا خوول بخوا و هەموو ئەوانەی لەسەر تەختەخەوەکان ڕاکشاون و نوستوون، ڕابپسکێنێ. گوێی لێ بوو چۆن با دەیلووراند و هەناسەدانە ڕیتمیکەکەی مانولوی دەبیست و دەیزانی ناتوانێ بنوێ. دەستوبرد دەرگەی یەکێک لە پشتیرەکان کەوتە تەقەتەق، بە دەنگەکەدا تێگەییشت کام دەرگایەیانە، پێیوابوو دەبوو بەردی لەبەردا دابنایە تا تەواو قاییم ببوایە. لە تاریکییدا بە دوای جلکەکانیدا گەڕا و چووە خوارەوە تا خۆی بگۆڕێت و مانولو بۆڕۆ نەکات. پووتەکانی لە هۆڵەکە بوون.

هەمدیس بەفر کەوتبووە بارین، با بە هەموو لایەکدا قامچی لە کلووە بەفرەکان دەوەشاند.

دەستی گرت بە چاوییەوە تا بارێزەکە بە شەوارەی نەخات. لایتە دەستییەکە بە کەڵک نەدەهات. هێور هێور چووە خوارەوە، بەسەر بەفرە بەستووەکەدا ڕۆیشت، کە چینێک بەفری تازەی لەسەر بارییبوو. دەرگەکە هێشتا هەر تەقەتەقی بوو. ئەو بەردانەی دۆزینەوە کە پێشتر بەکاری هێنابوون و لە شوێنی خۆیدا داینان، بە دیقەتەوە پاڵی بە دەرگەکەوە نا و پاشان بۆماڵەوە گەڕایەوە.



ڕۆژەکـانی دواتـر خـۆر پرشـنگی دەدا، بەڵام هێشتا هەر با ی هەبوو. میکوێل نەریتە کۆنەکەی خـۆی دەسـت پـێ کـردەوە، چـوون بـۆ سـانتا ماگدەلینا بەبێ چ گرفتێک و پاشان چەندێک بکرێ ئەولاوەتـر بەرەو ڕێـگە سـەربازییەکە، کە لەوێ بەفرەلـووکەی نـوێ و بە فـۆرمی نـوێ نیشـتبوو. یەکێـک لەو ڕۆژانە، کـاتێ بەڕێـوە بـوو بـۆ گونـد بگەڕێتەوە و نزیکەی نیو سەعاتێکی مـابوو بگات، مانولوی بینی بەرەو پیری دەهات. نەختێک نان و هەم و چەنـد پسـکیتێکی پـێ بـوو. میکوێـل سەریسـوورِما لەوەی کە ئەودوای ڕێـگەکە چ

هەستێک دایگرتووە، چۆن دڵی سووکەڵە بووە و خۆشحاڵە بەوەی مانولو بەرەو پیری هاتووە. ڕۆژی دواتر کاتێ لەوەدا بوو بکەوێتە ڕێ، لە مانولوی پرسی ئاخۆ ئەمجارەش هەمدیس بەرەو پیری دێ، مانولو وتی نیازی وایە بێت و هەر لە ئێستاوە نەخشەسازیی ئەوەی کردووە. میکوێل پێیوابوو شێوەی مانولو، کە لای تەباخەکەوە ڕاوەستابوو و ئەو وشانەی گوێ کردن، لەمیانەی گەشتەکەیدا، لە هەر خەیاڵێکی تر بە باوکی یان جوردی، یاخود ئەوەی لە کوێ لاشەی دایک بدۆزنەوە. لە زەینیدا زیندووتر بوو.

باوکی پارەی بەو ئیشە پەیدا دەکرد، کە لەلای بێرنات دەیکرد و ئێستاش قسەیەکی زۆر هەبوو لەبارەی فراوانکردنی کارگەی بەردتاشییەکەوە. هەموو هەفتەیەک شتێک پارەی بە مانولو دەدا، کە وا پێ دەچوو ئەوە باوک خۆی، لە کاتێکدا کە لە موبەقەکە دەبوو، بخاتە خوڵقێکی باشترەوە،

بەڵام ئەوە بۆ مانولو چ جیاوازییەکی گەورەی نەبوو. ئێوارەیەکی شەممە، کاتێ مانگێک بەسەر هاتنی مانولودا بۆ ماڵەکە تێپەڕیبوو، باوک باسی ئەوەی کرد ئەم ئێوارەیە ئێوارەی خۆشتنە. بە مانولوی وت خێزانەکەی، وەک جیاکردنەوەی ئاژەڵ لە ئەرز، لەوەدا کە ناوبەناو خۆیان دەشۆرد و بە شێوەیەکی ئاسایی ڕۆژێک لە هەفتەیەکدا، خۆی لە هەموو خێزانەکانی تری گوند خۆی جیاکردۆتەوە، بەڵام بەهۆی ئەو کێشانەوە کە ڕوویانداوە، هەر بە تەواوی ئەو نەریتەیان پشتگوێ خستووە، نەریتێک کە ئێستا ئەم ئاوات دەخوازێ باوی بهێنێتەوە.

باوک بانیۆ تەنەکە بریقەدارە پشت بەرزەکەی پیشانی مانولودا، ئینجا پێکەوە بۆ موبەقیان هێنا. بۆی روون کردەوە ئیشی مانولو ئەوەیە مەنجەڵە گەورەکە و دوو قابلەمە پڕ لە ئاو بکا و گەرمیان بکا، پاشان ئاوە گەرمەکە تێکەڵاوی ئاوی سارد بکا و دەبێ ئەو ئاوە بەشی خۆشۆردنی ئەم بکات.

وتی پاشان دەبێ مانولو ئاوی زیاتر بخاتە سەر تەباخەکە، کاتێ یەکەمین خۆشۆردن تەواو دەبێ، دەبێ بەشێک لە ئاوەکە بڕژێنرێ و بە ئاوی پاک و گەرم قەرەبوو بکرێ تا میکوێل و پاشان مانولوش خۆیان دەشۆن. دوایین شت، باوک کە پێدەچوو زۆر بە باسکردنەکەی خرۆشابێ، ڕوونی کردەوە، دەکرێ ئاوەکە بڕژێنرێ و سەگەکان لێی بخۆنەوە. ئەوەشی بۆ قسەکانی زیاد کرد، وێڕای ئەوەش کاتێ خۆمان شۆرد، هەر یەکەمان پێویستی بە جلک و دەرپێی پاکی ژێرەوەیە تا بیگۆڕین.

میکوێل سەریسووڕما لەوەی باوک بە گونجاوی زانی مانولوش بەشداریی لە خۆشۆردنەکەدا بکا. جاران تەنها ئەو و جوردی ئاویان دەکوڵاند و دەیانگۆڕی، لە کاتێکدا دایک دەچووە دەرەوەی ژوورەکە. کە خۆیان تەواو دەبوون ئەوسا ئاویان بۆ دایکیان دەکوڵاند و شۆرگەیەکی نوێیان بۆ پڕ لە ئاو دەکرد، سابون و لفکە تایبەتییەکە خۆی و

خــاولییەکی تایبەتییــان بــۆ دەهێنــا و لەســەر کورسییەکە دایان دەنا، پاشان خۆیان و باوکیـان دەچوونە سەرەوە تـا دایک بە ئاسوودەیی خـۆی بشوات.

مانولو سـێ خـاولی بە عەلاگەیەکەوە لەبەردەم ئاگرە نێڵە سەندووەکەدا هەڵواسین، دەریچەکانی داخستن و کاتێ ئـاوی قابلەمەکان کەوتـنە کـوڵ، کردنییە بانیۆکەوە و پاشان قابلەمەکانی هەمدیس پـڕ لە ئـاو کـردن. کـاتێ ئـاوی مەنجەڵە گەورەکە کوڵا و باوک کەوتە داکەندنی جلکەکانی، میکوێـل ژوورەکەی بەجێهێشـــت. ئەو هەمیشـــە هەر وای کردبـوو، چەنـدێک کرابـا بـاوکی بە ئاسـوودەیی جێدەهێشت. بە خەیاڵیدا هات شتێکی سـەیرە، کە مـــانولو لە ژوورەوە لەگەڵ بـــاوکە ڕووتەکەیـــدا جێبهێڵردرێ و بە دەوریـدا بـێ و خزمەتـی بکـات، بەڵام دەیزانـی مـانولو ڕاهـاتووە لە قەرەی هەمـوو شـتێک بێـت و ئاگـای لە خـۆیەتی شـتێک نەکـات

دواتر بۆی ببێته بابەتێک بۆ ڕەخنە و توانج لێ گرتن.

کاتێ بۆ موبەق گەڕایەوە، باوک وتی ئەو تا ڕادەیەک تەواو بووە و پاشان لە بانیۆکە هەستا و چاوەڕێ بوو مانولو خاولییەکەی بداتێ. میکوێل قەت باوکی ئاوها نەبینیبوو، لاقە درێژەکانی زۆر لەوە بەهێزتربوون، کە مەزەندەی کردبوو، زەکەری ئەستوور و گەڵوگونیشی هەر گەورەتر دیار و بەرچاوتر بوون. باوک وەک ئەوەی لەسەر شانۆیەک بێ، لەبەر ڕۆشنایی ئاگرەکەدا ڕاوەستا و خۆی وشک دەکردەوە، مانولوش بە خێرایی بە دەوریدا دەهات و دەچوو، کومبارێکی لەبەر پێیدا ڕاخست، نەختێک داری جنراوی هاویشتە ناو ئاگرەکە و ئینجا کەوتە ئامادەکردنی شۆرگەکەی میکوێل.

کاتێ باوک لە ژوورەکە چووە دەرەوە، میکوێل جگە لە دەرپێ کورتەکەی، هەموو شتێکی لەبەری

خۆی داکەند و دەستی برد بزانێ ئاوەکە چەندێک گەرمە، پاشان دەرپێ کورتەکەشی داکەند و ئینجا لە شۆرگە گەرمەکەدا لێی دانیشت، نیوەی ئاوی تازەو نیوەشی لەو ئاوەی کە باوک خۆی پێ شتبوو. بەرلەوەی جوردی بەرەو سەربازی بڕوا، لەگەڵ میکوێلدا سوعبەتی ئەوەیان دەکرد، کە باوک میزی کردووەتە ئاوەکەوە و میکویلیش بە تەمایە میزی تێ بکات، یاخود پێشتر کردوویەتی، بەو جۆرە جوردی خۆی لە بن میزی زۆر بێ ئەندازەی خاووخێزان دەنێ. جوردی بەردەوام بڕۆی گرژ دەکرد و داوای دەکرد شۆرگەیەکی تەنها بە ئاوی گەرمی پاکەوە دەوێت، بەڵام میکوێل پێیدەوت ئەوە شتێکی ماقووڵ نییە لەبەرئەوەی ئەو، کوڕە بچووکە.

میکوێل پێیوانەبوو مانولو گوێ بداتە ئەوە. کەوتە خۆ شۆردن لە کاتێکدا مانولو ئاوی زیاتری بۆ خۆشتنەکەی خۆی دەکوڵاند. میکوێل تێبینیی

کرد کاتێ بە ئەسپایی لە ئاوەکەدا دانیشت. مانولو تەماشای دەکرد. لەکاتێکدا میکوێل خۆی دەشۆرد، مانولو لە نزیک شۆرگەکەوە بوو، گوێیان لە باوک بوو لە ژوورەکەی سەرەوە دەهات و دەچوو. میکوێل دەیزانی باوک تا دوای تەواوبوونی خۆشتنەکە، خۆی بە ژووردا ناکاتەوە.

کاتێ لە شۆرگەکە هەستا، مانولو بە خاولییەکی گەرمەوە بەرەو ڕووی هات. میکوێل ڕاوەستاو و دەڕەجفی، ڕووی کردە ئاگرەکە، هاوکاتییش مانولو پشت و مل و قەدی وشک دەکردەوە و توند دەیگەمراند. پاشان خاولییەکەی بۆ میکوێل ڕایەڵ کرد تا تەواو خۆی پێ وشک بکاتەوە.

ئێستا ئاوەکەی مانولو کەوتبووە کوڵ، بەشێک لە ئاوە کۆنەکەی ڕشت و پاشان ئاوی تازەی لە دوو قابلەمەکە و مەنجەڵە گەورەکەوە ڕشتە شۆرگەکە. کاتێ میکوێل دانیشت و خۆی لەبەر

دەکـرد، بینـــی چـۆن مــانولو پشــتی لێیەتــی و جلکەکانی دادەکەنێ، تـا تەواو ڕووت نەبـۆوە، لای نەکردەوە. مانولو زۆر چوارشـانەتر بـوو لەوەی کە میکوێل لە ژووری نووسـتنەکەدا سـەرنجی دا بـوو، ماسوولکەکانی شان و پشتی گەشەکردووتر بوون، قەد و ڕانی هەر تەواو بێ تووک بـوون، بەڵام لاقە کــورتە ئەســتوورەکانی تەواو بە تــووکێکی ڕەش پۆشرابوون. هێور هێور و تا ڕادەیەک نـازک بەرەو بانیۆکە ڕۆیشت و زۆر بە ئاشکرا دیـاربوو دەیزانـی میکوێل لێی ورد دەبێتەوە.



لەبەرئەوەی باوک هەموو ڕۆژێک لەگەڵ جوزیف بێرنات دا دەڕۆیشت، میکوێل وتی ئەگەر مانولو حەز بکات و کاتی هەبێ، دەتوانێ پێشتر بەرەو پیری بێت، بەو تەرزەش میکوێل چ پێویستی بەوە نەدەبوو هەموو ڕێگەکە بە تاقی تەنها بگەڕێتەوە. هەروەها پێیوت خواردن بۆ خۆی بهێنێ و بوتڵێک ئاویش، ئەوسا شوێنێک لەبەر هەتاودا دەدۆزنەوە و دەتوانن پێکەوە نان بخۆن. شەوانە چاوەڕێی ئەوە دەبوو بۆ ژووری نووستنەکە بچێ و لەگەڵ مانولودا بە تەنیا بێ و بەر لەوەی بنوون، قەیرێک قسە لەگەڵ یەکدی بکەن.

لە یەکێک لەو ڕۆژانەدا کاتێک کە بەرەو ماڵ دەبوونەوە و بە بەفرەکەدا، کە لە گردۆڵکە و لەوەڕگەکاندا نیشتبوو، دەیاننۆڕی، لەنێو درەختەکانی ژوور سانتا ماگدەلیناوە گوێیان لە تەقەی تفەنگێک بوو. تەقەکە بە گوڕێکی خێرا هات و لە دوورەوە لە چیاکاندا دەنگیدایەوە، نەدەکرا بزانرێ ڕێک لە کوێوەیە. میکوێل بیری کەوتەوە پێشتر جێبێکی پڕ لە زەلام کە عارەبانەی لێ بەستراو و فویکس و کاستەلێتیان لەگەڵدا بوون، بە ڕێگەکەدا بە لایدا تێپەڕی، پاشان جێبەکەی بە بەتاڵی بینی بوو، کە لە لای دێرەکەی خودی سانتا ماگدەلیناوە ڕاوەستابوو.

وا پێ دەچوو تەقەکە هاوسەنگی سروشتی بە یەکدا دابێ، هەر هەموو مەلەکان ڕەوینەوە، میکوێل پێیوابوو یەکە بە یەکی بوونەوەرانی زیندوو لە حەژمەت ترس و زەندەقچوون پەرتەوازە بووبوون. لەگەڵ مانولودا ڕاوەستان و چەند

تەقەیەکی تریش، ئەمجارەیان چوار یان پێنج تەقە بوون، گوێ لێ بوو. کتوپڕ کوڵی گریان بەر بینگی میکوێلی گرت، ئاخر هەر زۆر ڕێی تێ دەچوو ئەو زەلامانە ڕاویان لەو جێگەیەدا کردبێ کە دایکی لێ ڕاکشابوو. زۆر ڕێی تێدەچێ دایک ڕێک لێرەدا لە ڕێگەکە لای دابێ، وایزانیوە ڕێگەکەی پێشەوەدا، ڕووبەرێکی سپیی تەختانییە. میکوێل حەزی نەدەکرد ئەو زەلامانە لاشەکەی بدۆزنەوە، حەزی نەدەکرد سەگەکانیان بۆنی بکەن و بیلێسنەوە. کاتێ دەنگی تەقەی تر هات، بە خێرایی لەگەڵ مانولودا بۆ دواوە گەڕانەوە. مانولو لێی پرسی بۆچی بەرەو لایان دەگەڕێتەوە، میکوێل وەڵامی نەدایەوە. بۆ چرکەساتێک دایکی بە زیندوویی لەبەردەم خۆیدا بینی، زراوەترەک لە زەلامەکان هەڵدەهات، نائومێدانە هەوڵی دەدا بە گوللەکانەوە نەبێت. کاتێک خۆیان گەیاندە هەورازەکانی پشت کڵێساکە، گوێیان لە هاوار هاوار و وەڕەی سەگ و

سێ تەقەی تر لە هەمان تفەنگەوە بوو کە لەنێوان هەر تەقەیەکیانـدا وچـانێکی کـورت و شـێلگیرانە هەبـوو. ئینجـا نـاڵەیەک و پاشـان قیژەیەکیـان بیسـت، میکوێـل ئامـاژەی بـۆ مـانولو کـرد پـێ هەڵبگرێ تا هاوارێکی کتوپڕ ئیستی پێ کردن.

- هێی جەماعەت!.

ئەوە دەنگی فویکس بوو. "لەم ناوە مەمێنن! چییە دەتانەوێ بەر فیشەکێک بکەون؟"

میکوێل هاواری کرد: "ئێوە لێرە چی دەکەن. دەتوانن بڕۆن و لە شوێنی تر تەقە بکەن؟".

- ئێمە ڕاوەبەراز دەکەین. ئەوە ئیشی پیـاوانە. ئەگەر نەگەڕێـــنەوە ئەوا بـــۆ تـــۆ و تـــوڵفە بچکۆلانە چێشتلێنەرەکە شتێکی خۆش نابێ.

مـانولو چمکـی چاکەتەکەی میکـوێلی ڕاکێشـا، مەبەستی لەوە بوو بڵێ، کە ئەویش لەگەڵی دێـت. وردە وردە بەنــاو بەفــردا چــوونە خــوارەوە، بە ئـازایەتییەکەوە دەڕۆیشـتن، کە میکوێـل لەکـاتی

هەڵگژاندا تێبینــی نەکردبــوو، پێیــان بەر ســەهۆڵی ژێر بەفــرەکە دەکەوت، بەڵام چەنــدێک کرابــا خێــرا خۆیان لە ڕاوچییەکان دوور خستەوە.

بەبـــێ ئەوەی لەگەڵ یەکدیـــدا بـــدوێن بەرەو ماڵەوە بوونەوە. مانولو دەستی نابووە سەر شانی میکوێل. گوێیان لە چ تەقەیەکــی تــر نەبــوو. دوای ماوەیەک ورەی جێبەکە هاتەوە گوێیان کە نزیکیان دەبۆوە و بە قەراغی ڕێگەکەدا دەهات. کاتێ بەرەو پێشەوە دەهات، زەلامەکــانی نــاوی بە شــێوەیەکی ســەیر خودئاگــا لە گونــاه و ڕوخســاریان قەڵــس دەینواند. کاتێ بە لایاندا تێپەڕی، خاوی کردەوە و میکوێـــــل ئەو ورووژانە بـــــێ ئـــــاوڕووانەیەی لە ڕوخسارياندا خوێندەوە. لە ناو عارەبانەکەدا، سفت لەســـەر یەک، چــوار بەرازە کێــوی بە لاشـــەی لە خوێن شــەڵاڵ و قــورس بە مــردن، فــڕێ درابــوون، ئــاژەڵانێکی دڕی تــا نەختێــک لەوەوبەر بە گــوڕ و ســاخ و پــتەو، باڵادەست لە دونیــایەکی ســارد و

تاریکدا، بەڵام ئێستا هەر تەواو پێچەوانەی ئەوە بوون، ئێستا هەر کرگراگە و گۆشت و ئێسک و چاوانێکی زەقی مردوو بوون، لەو عارەبانەیەوە کە هەڵیگرتبوون، دڵۆپە خوێنی تەنیا، تک تک دەچکایە سەر بەفرەکە، پاشان کاتێ عارەبانەکە لارو گێڕ دەبۆوە، خوێنەکە دەچکایە نێو گۆماوێکی گچکەی پڕ لە خوێنی سووری گەشەوە.

میکوێل بە دەم ڕۆیشتنەوە کەوتە هەنسک هەنسک، لێ گەڕا مانولو لە باوەشی بگرێ و دڵی بداتەوە. بۆ یەکەمین جار و بە یەک کەڕەت هەستی بە سەختییەکی بەرچاو لە دیارنەمانی دایکیدا کرد، خەیاڵی ئەوەی کاتێ دەیدۆزنەوە و لە ژیاندا نەمابێ، وەک حەقیقەتێکی ناچارانە وەدیاردەکەوت. لە فیکرەوە چوو کە دایک چیدی ناگەڕێتەوە بۆ لایان، ئیدی دۆزینەوەی هیچ ناگەیەنێ، گەڕان بە دوایدا شتێکی بێ مانایە. دوای ماوەیەک لە گریان ژیر بۆوە و سفت خۆی بە

مـانولووه نووسـاند و له کاتێکدا که بەنێـو قـوڕ و چڵپاوی بەفردا ڕێیان دەکرد، ناو بەناو دەسـتی بە شانیدا دەهێنا و نەوازشی دەکرد.

مـــانولو پێـــی وت: "هەر بە ڕاســـتی تـــۆ بەختەوەریت".

میکوێل وەڵامی نەدایەوە.

- بەختەوەریت چونکە ئیـدی ئەوەی بە سـەرتدا هـات، تێـپەڕی، چـونکه دایکـت له دەسـتدا.

لەبەرئەوەی جارێکی تر ئەوە ڕوو ناداتەوە.

میکوێل وتی: "حەزم دەکرد زیندوو بووایە و له ماڵەوە بووایە".

- ئا، بەڵام هەمیشه له ترسـی ئەوەدا دەبوویـت که شـتێکی لـێ ڕووبـدات، که بمرێـت، بەڵام ئێسـتا له کـۆڵ ئەوە بـوویتەتەوە. ئیتـر ئەوە ڕوویداوە و بڕاوەتەوە. هەمدیس ڕووناداتەوە.

میکوێل وتی: "ئاوها قسان مەکە".

میکوێل وتی: "لە دووایین جێگەدا، کە دەژیام پیرەمێردێک مرد و هەموو مناڵەکانی هاتن، هەندێک لەو منالآنە خۆیان پیر بووبوون. ئەگەرچی پیرەمێرد ماوەیەکی زۆر بە گیانەوە بوو، کەچی ئەوان ڕۆژ دوای ڕۆژ هەر بۆی دەگریان. چەند هەفتەیەک دواتر، ژنێکم لە ماڵەکەدا ببینی دەگریا. کاتێ خوشکەکەی هات پێکەوە گریان، کاتێ براکەی هات زیاتر گریان. من دەمزانی هیچ کەسێک نییە ڕۆژێک لە ڕۆژان بتوانێ بمخاتە گریان، هیچ کەسێک نییە بمرێ و بمخاتە گریان. هیچ کەس. منیش سوپاسگوزاری ئەوەم. واش پێ ناچێ هەرگیز ئەوەم تێدا بگۆڕدرێ. باوک و دایکم هێند زوو مردن کە من هەر بیریشم نایەنەوە، تەنانەت باوکم بەر لە لەدایکبوونم مردبوو. چ یادەوەرییەکم لێیان نییە. من چ خوشک و برام نین، هەست بە چ شتێکی تایبەتییش بەرامبەر مام و پوورزا و خاڵۆزاکانم ناکەم. هەموو جارێک کە

شـێوەی کەسـێک دەکەم لەوان دەچـێ، بەزەیـیم پیایاندا دێتەوە. باشترە نەتبێت. تۆ بەختـت هەیە کە ناتوانرێ هەمدیس دایکت لێ زەوت بکرێتەوە.

میکوێـل تەماشـای دەوروبەری خـۆی کـرد و زانـی کە چەنـدێک حەز بکـات دەتـوانێ لەم ڕێـگە چۆڵەوانییەدا، مانولو لە ئامێز بگـرێ و چـۆن حەز بکا بە خۆیەوە ڕایموسێت. باسـکی تێـوە ئاڵانـد و کاتێ دەستی نایە ژێر قەمسەڵەکەیەوە، هەستی بە گەرمایی لەشـی کـرد، بـۆنی ئـارەقەی کراسـەکەی دەکرد و هەستی بە لێدانی دڵی دەکرد. کراسەکەی هەڵکێشـا و پاشـان دەسـتی نـایە سـەر پێسـتە گەرمەکەی پشـتی. مـانولو خـۆی بەرەو ڕووی چەمـانەوە، جەسـتەکان بەسـەر یەکـدا تـوانەوە، سەری خستە سەر شانی، بەڵام لێگەڕا دەستەکانی وەک ئەوەی بەرد بن، بەملاولایدا شۆڕببنەوە.



کاتێ ڕۆژی دواتر مانولو تاکی پەنجەرەکانی کردنەوە، میکوێل بینی ئاسمان شینە و هەتاو هێند تینی هەیە، کە شووشکەی سەهۆڵی شۆڕبووەوەی بە لێواری سەربانەکەدا، دەدڵۆپاندن و دەیخستنە خوارەوە. بێرنات لە موبەق لەگەڵ باوک دا دانیشتبوون و باسی ئەوەیان دەکرد کەشوهەوا بەرەو خۆشبوون دەڕوا و تەمی سەر شاخە دوورەکان ئاماژەی ئەوە دەدا کە بەفر هەر بە ڕاستیی کەوتۆتە تووانەوە. کاتێ میکوێل ئەو ڕۆژە چووە دەرەوە، بەردەوام گوێی لە سەهۆڵ بوو کە دەشکا و دەیکردەوە، گوێی لە بەفر بوو، کە

دەتـــووایەوە و دەبـــووە جـۆگەلە و گـوێی لە ئـاو دەبـــــوو، کە بە درێژایـــــی ڕێـــــگەکە دەڕژایە چاڵیوچۆڵییەکـانییەوە. بە دووربیـــنەکەی بەفـــری دەبینی دەچۆوە یەک و لەو دوورایییـانەڕا پەڵەپەڵە دەبوو.

ڕۆژی دواتر خاڵۆ لە پالووسـاوە هـات و وتـــی بەفـر لە هەورازەکـانی نێـوان گونـد و کـوول دێـل سـودا کەوتـۆتە تـووانەوە. وتــی لە گوندەکانـدا هەمووان چاو بۆ داڵە لاشەخۆرەکان دەگێڕن کە بە دڵنیـاییەوە پێبەپێـی خۆشـتربوونی کەشـوهەوا، بەرەو ژووروی کـوول دێـل سـو دەبـنەوە. وتـــی هەڵـــبەتە گوندنشـــینەکان شـــوێنفڕینی داڵە لاشـەخۆرەکان، هەر کاتێـک پەیـدابوون، دەکەون. دەبێ میکوێل و بـاوکی و هاوسێکانیشـیان هەمـان شـت بـکەن. وتـــی، زۆر ناخـــایەنێ ئەو بەفـــر و سـەهۆڵەی لاشـەکەی داپۆشـیوە، بـــزر دەبـــێ. هەروەها وتی حەز دەکا بەر لەوەی بەرازە کێوی و

گورگ و داڵە لاشەخۆرەکان بیدۆزنەوە، ئەم خۆی بیدۆزێتەوە، بەڵام یەکەمجار داڵە لاشەخۆرەکان لە قەرەی ئەوە دێن. ئەوە داڵە لاشەخۆرەکانن، کە دەبێ چاویان بۆ بلەوەڕێنرێ.

دوای چەند ڕۆژێک لە پلەی گەرمای بەرزتر، بەشێکی زۆر لە ڕێگە سەربازییەکە دەستڕەس بوو. میکوێل کە دونیا تاریک دادەهات، بە توندی پەرۆشی دوو شت دەبوو، یەکێکیان ئەوە بوو، دایکی بگەڕێتەوە ئیتر گرینگ نییە لە چ شێوە و فۆرمێکدا دەگەڕێتەوە، ئەویتریشیان ئەوە بوو دڵنیابێ کە زەمەنی بزربوونی دایک کۆتایی هاتووە و بەفری لە کۆڵ بووەتەوە. بیری لە ڕوخساری دایکی دەکردەوە، ئومێدەواربوو بیتوانیبا هەمدیس وەک خۆی بیبینێتەوە، وەک ئەوەی نووستبێ یان لای پەنجەرەی موبەقەکەوە دانیشتبێ. کاتێک ڕۆیشت بیری لەوە دەکردەوە چەند خۆش بوو بیبینیبایە کە زەردەخەنەی دێتێ.

میکوێل ئێستا دەیتوانی چەند سەعاتێک بڕوا بەبێ ئەوەی بەربەستی لە بابەتی گردۆڵکەبەفر و گاشەسەهۆڵ بێتە ڕێی، کاتێ ماندوو دەبوو، خۆی ناچار دەکرد لەسەر ڕۆیشتن بەردەوام بێت، تەواویش لەوە وەئاگا بوو کاتێ لە سانتا ماگدەلینا دەردەچێ، ئیدی هیچ جێگەیەک نییە بتوانێ پشووی تێدا بدا. دوای ئەوەی مەودایەکی درێژی بڕی، سەرنجی دا خەیاڵی پڕە لە وێنە و دیمەن وەک ئەوەی خودی هەواکە بەنگێک بێ کە وا دەکا وەهمەکان وەک شتی تەواو ڕاستەقانی ببینرێن. لەژێر کاریگەریی ئەو جادووە نیگەرانیی وروژێنەرەدا، ناو بەناو ڕوخسەتی بە خۆی دەدا لە ساتەوەختی کورت کورتدا خۆی نەبێت، هەستی دەکرد ئەو چیدی میکوێل نییە، بەڵکو کەسێکی ترە کەچی دایک هەر بەرەو پیری دێت و ئەمیش سەریسوورماوە و لە فیکرەوە چووە، کە ئاخۆ لەو ماوە دوور و درێژەی نووستندا، چی لێ بەسەر

هـاتبێ. دایـک دەبـێ دەسـتبەجێ هـاوار بکـا و بیناسـێتەوە، نەک وەک کـوڕێکی کە بە دوایـدا دەگەڕێ، بەڵکو وەک باوکێک کە ئەم بچکۆلە بووە و هەیبووە، باوکێک کە دەهات و بە دوایدا دەگەڕا. ئەم دەبـێ بەرەو پیـری ڕابکـا و چـاوەڕێ بکـا لە باوەش بگیرێ و هەڵببرڕدرێ، ئەویش دەبـێ مـاچی بکا و بەرزی بکاتەوە، ئەو کیژە بۆ دوور ڕاکردووە، دەسکێشـەکانی، دەسـتیان بە گەرمیـی ڕاگرتبـوو، پـاڵتۆ کـۆنە سـەوزەکەی بە ئـێخەی پێسـتەییەوە، ئەوەی کڵاوی بەفرەکەی هەبـوو، پۆشـیبوو، تەنهـا دەموچـاوی تەزیـو و چـاوانی لە حەژمەت سـەرما ئاونگاویی ببوون. گەرچی چۆقەی ددانـی دەهـات، بەڵام هەوڵی دەدا زەردە بیگرێ.

میکویـل بەرەو خـوار لەگەڵ خۆیـدا، دایـک بـۆ ماڵە دێرینەکەی لە پالووسا دەباتەوە، دەیهێنێتەوە بـۆ بـنکەی پـۆلیس و بە بـۆنەی دۆزیـنەوەیەوە زەماوەند دەگێڕن، دەیهێنێتەوە بۆ لای بـراکەی کە

چاوەڕێی کردووە، دەیهێنێتەوە بۆ بەر کوانووە گەرمەکە و بۆ سەر تەختەخەوە کۆنە جوانەکە. جارێکیان هێنایە بەر چاوی خۆی مانولوش لەوێیە، بەرهەڵبێنەیەکی پۆشیو و خواردنەوەیەکی گەرمی ئامادە دەکرد، تەواوێک ڕەنگپەڕیو و شڵەژاو بوو، بەڵام بە هۆیەک لە هۆکان حەزی نەدەکرد خۆی وا پیشان بدات. مانولو لەوێ بەشێک نەبوو لە خێزانەکە.

دوای هەفتەیەک لە تواندنەوەی بەفر و لە عەسرێکی درەنگدا، یەکەمین داڵە لاشەخۆرەکان بە ئاسمانێکی سارد و شینەوە وەدیارکەوتن. میکوێل هێشتا لە دەرەوە و دەڕۆیشت، داڵە لاشەخۆرەکان ڕەش ڕەش بە ئاسمانی پارچە زەوینێکی ژوور پالووسا، بەڵام خوار ڕێگە سەربازییەکەوە، دەخوولانەوە. ڕێک بە ژوور ئەو جێگەیەوە دەسووڕانەوە، کە خۆی و باوک و ئەوانی تر مەزەندەیان دەکرد دایک لەوێ ڕاکشابێ. کاتێک

میکوێل بە دووربینەکەی هەڵیدەسەنگاندن، بیری لەوە کردەوە بۆ گوند بچێتەوە و بە دوای باوکیدا بگەڕێ کە دەیزانی لەو نزیکانەوەیە، پاشان پێکەوە بە جێبەکە بە هەمان ڕێگەدا بێنەوە، بەڵام دڵنیابوو باوک، یان هەر کەسێکی تر لە گوند، باڵندە کێوییەکانیان چاو کردووە و دەسبەجێ بە ڕێ کەوتوون. هەروەها لەوەش دڵنیابوو خاڵۆش بینیونی. میکوێل لەگەڵ قسەکەی خاڵۆی دا بوو، کە دەیوت ئەوەی دایکی خۆشویستووە، دەبێ یەکەم کەس بیدۆزێتەوە.

بۆ پێشەوە درێژەی بە ڕۆیشتندا و ناوبەناویش ڕادەوەستا تا بە دووربینەکەی داڵە لاشەخۆرەکان هەڵبسەنگێنێ. دوو باڵندە بە ئاسمانێکی بەرزەوە بوون و نەدەجووڵان. نەیدەزانی ئاخۆ داڵە لاشەخۆرەکان چۆن ڕەفتار دەکەن، بەڵام پێیوابوو لە دوو باڵندە زیاتر پێویستە کۆببنەوە، تا دابێنەوە و چەنگاڵ و دەنووک لە نێچیر بووەشێنن.

نەیدەزانی ئەوان کە نێچیرێک دەدۆزنەوە، کات چەند دەخایەنێ تا کۆدەبنەوە. ئومێدەواربوو بیخایەنێت، لەبەرئەوەی پێی خۆش نەبوو پێویست بەوە بکا بە تەنها لە دوورەوە چاودێرییان بکات، نەیدەزانی ئاخۆ ئەگەر زۆربن، توانای ئەوەی دەبێ بیانترسێنێ و لە نێچیرەکەیان دوور بخاتەوە.

هەرزوو چاوی بە داڵە لاشەخۆریکی تر بەسەر ئاسمانی کوول دێل سوەوە کەوت، دەیزانی لە مەودای چەندین کیلۆمەترەوە دەبینرێت. ئاسمان شینێکی ڕوون بوو بەبێ چ تەنکەهەورێک، هیچ شتێک نەدەجوولا، جگە لە جووڵەی باڵندەکان بە ئاسمانەوە. کاتێ یەکێکیان پەیدا بوو، میکوێل پێی هەڵگرت و بیری لەوە دەکردەوە ئاخۆ دەبێ پەلکەدارێک لە درەختێک بکاتەوە تا شتێکی پێ بێ لێیان بدا. ئەو حیسابی ئەوەی دەکرد خاڵۆی بە سەعاتێک یان زیاتر خۆی دەگەیەنێتە قەدپاڵەکانی ژوورو، واتە شوێنێک کە باڵندەکانی

لێ کۆببوونەوە. سەبارەت بە باوکیش، ئەگەر بە جێبەکە بێت، خێراتر دەگات. ئێستا ئەو خەمی ئەوەی بوو کاتێ دەگاتە سەر شانۆی ڕووداوەکە، ئەم بە تاقیتەنیا بێت. ئاخر ئەو تەیرە بەدفەساڵە دڕ و بێدەنگ و برسییانە، کە لاسارانە بەو بەرزاییانەی ئاسمانەوە خوولیان دەخوارد، ئەم هەر بە هیچ نازانن. ئەو شتە دەکەن کە سروشت فێری کردوون جا ئیتر با میکوێل بە چ مەبەستێکەوە هاتبێ، لە چاوی ئەواندا لە فیڕنەگولەیەک زیاتر نەبوو، تاقە شتێک دەیتوانی بیکات ئەوە بوو بە پەلە خۆی بگەیەنێتە ئەو شوێنەی ئەوانی بە سەردا دەسووڕانەوە. تەنها ببینێ لە کوێ دەنیشنەوە، ئەوە باشترە لەوەی ئێستا بگەڕێتەوە و دایکی لەژێر ڕەحمەتی دەنووک و چەنگاڵەکانیاندا جێبهێڵێ، بێ داڵدە و بێ پشتوپەنا جێی بهێڵێ.

دوو داڵە لاشـــەخۆرەی تـــر بەو ئاســـمانە ڕۆشـنەوە، بە بـاڵ لەیەکـدانەوە هـاتن. میکوێـل ڕاوەسـتا و بە دووربیـنەکەی تەماشـای کـردن، سەرنجیدا چەند گەورەن و چەنـد ئاشـکرا ڕەنـگ و ڕوویـان نـاحەزانەیە، ئێسـتا پێـنج شـەش دانە دەبوون. نەیدەزانی ئاخۆ ئەو ژمارەیە بەسە بۆ دەسـت پـێ کردنـی سـرووتی هێـرش بـردن و داهاتنەوە و خواردنی نێچیرەکەیان، سرووتێک، کە لە تاریکایی ناخیاندا حەشار دراوە و ئاخۆ لە چ وادەیەکـدا دادێـنەوە و هێرشـەکەیان دەسـت پـێ دەکەن.

لە فیکرەوە چوو خۆ ڕەنگە زیاتر بەبێ پلان و بە گۆترە و بەبێ حیساب بەرەو ئەرز دابێنەوە. لە هەمـوو ئەو سـاڵانەدا، میکوێـل ئەو باڵنـدانەی بە گـرووپ بینیبـوون کـۆ دەبـوونەوە، بەڵام قەت نەیبینیـوون بخـۆن، خۆیـان لە گونـدەکان بە دوور ڕادەگرت، چ کاریان بە کاری ڕانەمەڕێکی ساغەوە

نییە. حەزی دەکرد شتی زیاتری لەبارەوە زانیبان، چۆن بنیادەم دەیانترسێنێ و دەیانڕەوێنێتەوە، یاخود هێرشەکەیان چەندێک دەخایەنێ.

کاتێ باوک بە جێبەکەیەوە بەرەو پیری هات، دووان لە داڵە لاشەخۆرەکان نیشتنەوە و ئەوانی تریش، کە ئێستا پێنج یان شەش دانە بوون، بە بەرزاییەکی نزمترەوە بوون. باوک ڕوخساری لە ساو و تووڕەییدا هیشک و پڕ لە ئیرادەیەکی بەهێز بوو، ئەو جێبەکەی دەئاژوو و جوزیف بێرنارت لە لایەوە و مانولوش لە دواوە بوو. بە حاڵ بۆ میکوێل ڕاوەستا. کاتێ بازیدایە ترومبێلەکەوە، بینی دوو تفەنگ لەسەر ئەژنۆی بێرنات دان. باوک خێرا و پێچەقێن، بەرەو لای باڵندەکان پێی بە بەنزیندا نا.

میکوێل دەیزانی چاوی نێچیرەکە چی بەسەر دێت، دەیزانی باڵندەکان یەکەم جار دەنووک لە چاوی دەدەن، پێیوابوو ئەوان هەر ئێستا لەو

دەنووک لە چاو وەشاندنە بوونەتەوە، دەشێ ئەوە بەهێزترین یان خێراترینیان بێ کە ئەو قازانجەی کردبێ. دەکرێ دەرهێنانی چاوی کەسێک کاتێکی زۆری پێ نەوێت، دەشێ هەر خوێنیشی لێ نەیەت، مەزەندەی کرد بۆی هەیە خوێنەکە مەیی بێ یاخود وشکی کردبێت. هەروەها مەزەندەی ئەوەشی کرد، کە ئەوان خۆیان بۆ بەشە نەرمەکانی جەستە تەرخان بکەن و سەر و قۆڵ و لاق هەڵگرن بۆ دوایی، کاتێ جێبەکە بە ڕاتەکانێکەوە ڕاوەستا و ئەوانی لێ دابەزین و چەندێک لە توانایاندا هەبوو بە پەلە بە لێژاییەکەدا شۆڕبوونەوە، میکوێل نائومێدانە هەوڵی دەدا بەر بە کوڵی گریانی خۆی بگرێ.

نەختێک لە خوارەوە سەکۆیەکی ساف هەبوو، باڵندەکان لەوێ کۆببوونەوە. میکوێل حاڵی نەدەبوو چۆناوچۆنی دایکی گەییشتووەتە ئەوێ، لە فیکرەوە چوو. ناکرێ لە جێگەیەکی ئاوها کراوەدا

هەڵدێررا بێ، بەهەرحاڵ دوورتر، ئەو شقەڕێگەیە هەبوو کە بەرەو پالووسا شۆڕدەبۆوە. دووربینەکەی بۆ باوک ڕایەڵ کرد و کاتێک بێرناتیش بە دووربینەکە تەماشای کرد، ئینجا خۆی وەریگرتەوە و لە شوێنەکە وردبۆوە. باڵندەکان بە تەواوەتی شوێنی خۆیان بە دەوری نێچیرەکەدا نەگرتبوو. باڵندەی زل و بەدفەساڵ و پیسوپۆخڵ دیاربوون، وەک ئەوەی کوێراییان داهاتبێت، خۆیان بە یەکدیدا دەدا. پاشان سەرنجیان لەسەر پەڵەیەک چڕ کردەوە و کەوتنە دەنووک وەشاندن، یەکتریان پاڵ دەنا. کاتێ باوک و بێرنات، بە پێدزکێ چوونە پێشەوە، مانولو هاتە تەنیشتی ئەم و ئەمیش لە حەژمەت بینینی ئەو شتەی کە دووربینەکە گەورەی دەکرد، لە پەلوپۆ کەوتبوو. داڵە لاشەخۆرەکان تۆپەڵە گۆشتیان لە ناوزگ دەپچڕاند، کوت کوتیان دەکرد، چڵێسانە و بە تاموچێژەوە دەیانخوارد و بۆ کوتی زیاتر خۆیان

دەترنجانە پێشەوە. میکوێل دووربینەکەی ئاراستەی یەکێکیان کرد، کە چەنگاڵی توند لە ئەرزەکە گیرکردبوو تا پێگەی خۆی تۆکمە بکا و باشتر گۆشت بپچڕێ، میکوێل کە ئەوەی بینی دووربینەکەی لە دەست کەوتە خوارەوە، هاواری کرد و بەرەو لای باوک و بێرنارت ڕایکرد و مانولوش بە دوایدا.

کاتێ نزیک بوونەوە، باڵندەکان کەوتنە شوێنگۆڕکێ بەڵام لەگەڵ باڵلێکدانە تووڕەکانیاندا، بۆنێکی ناخۆشیان لە دوای خۆیانەوە جێدەهێشت. پێیوابوو بۆنەکە ترش و ترسناکە، بۆنەکە بۆنی گۆشتی گەنیو نەبوو، بەڵکو بۆگەنی شتێکی زیندوو، بۆگەنی هێزێکی دڕندانە بوو، بۆنی خودی باڵندەکان بوو، پێیوابوو بۆگەنە تیژەکانیان هی ئەوەیە کە شتێکی بۆگەن و مردوویان خواردووە.

میکوێل تا ڕادەیەک زەردەی هاتێ کاتێ بینی ئەو باڵندانە لە دەوری چی کۆبوونەتەوە. خۆی

ئامــــادەکرد تـــا ڕیخــۆڵەی دایکــی ببینـــێ کە دەردەهێنرێ وەک ئەوەی ئاژەڵێکی پیری جێهێڵراو بێــت، هەروا خۆیشــی ئامــادە کــرد تــا بە هەرچ توانایەک هەیەتـی، بەرگری لە دایکـی بکـات. ئەو وای دەبینـــی باڵنــدەکان بــۆ ئێــرە فڕیــون، نەک لەبەرئەوەی دایکـی ئەمیــان بینیــوە، بەڵکــو بــۆ ئەوەی دەنووک لە سەگێکی گەورە بدەن، سەگێکی ڕاوی هێنـــاونەتە یــاد، کە تـــا ســـەر ئێســـک دەنووکئــاژنی بـکەن. لەبەرخـۆیەوە وتـی هەبـێ و نەبـــێ زســـتانێکی ســـەختیان تێپەڕانـــدووە. لەبەرخۆیەوە وای وت و ئیدی کشایەوە دوا.

کــاتێ یەکێــک لە داڵە لاشـــەخۆرەکان بــێ شــەرمانە بەژوور ســەریاندا فـڕی، میکوێـل بـاوکی بینـــی تفەنـــگەکە هەڵـــدەبڕێ. لەو مەودا کەمەوە، باوک فیشەکێکی ڕووەو باڵندەکە تەقاند. ئەوەیان کە پوولەکەییترین باڵ و کەللەییترین وزەی هەبوو، گــوڕی فیشــەکەکە، ڕووەوە خــوارەوە پێچـی پـێ

خوارد و هاوکات ئەوانی تریش فڕین یاخود باڵە تەپۆکانیان لەیەکدا و بە تووڕەیی کشانەوە.
باڵندە پێکراوەکە، کە تا ڕادەیەک هەڵدەستا و دەکەوتەوە، کەوتە قاژەقاژ، هەوڵی دەدا بفڕێ بەڵام هەمدیس دەکەوتەوە. لەناکاوێڕا توانی سەر بەرز بکاتەوە، کەچەڵ و قیرسیچمە و ئەوپەڕی پڕ لە زیندەگی بوو، چاوانی لاسار و بڕندە بوون، کونە کەپووی تا ڕادەیەک ئاگری لەنێو دەنووکە دڕندانەکەیەوە دەردەکرد. داڵە لاشەخۆرەکە تەماشای کردن، هەر هەموو ئەو ڕقە ئەستوورەی بەرامبەریان، ڕوانینە دڵڕەقانەکەی و ساوە بە زەبرەکەی، میکوێلی ئەنگاوت وەک ئەوەی هەر هەمووی ئاراستەی ئەو و بە تەنها لەگەڵ ئەوی بێ، وەک ئەوەی ڕۆحەکەی ناخی، بە درێژایی ژیانی چاوەڕێی ڕووبەڕووبوونەوەیەکی ئاوها بووبێ.
ئەو باڵندەیەی کە ئیدی لە سەرەمەرگدا بوو، لە شڵەژان و بەدبەختیی خۆیدا، لەودیو هەر هەموو

شتێکی مرۆڤانەوە بوو، هێشتا هەر لە حەژمەت ئازار دەیقاژاند. میکوێل نەیزانی بۆچی وا خەریکە دەچێتە پێشەوە بۆ لای، بەڵام زوو بەزوو سەرنجی دا کە مانولو لە دواوە گرتوویەتی، لێناگەڕێ ئەولاوە تر بچێ و هاوکاتیش باوک هەمدیس تفەنگەکەی بەرزکردەوە. میکوێل خۆی بۆ دواوە ڕووەو مانولو دانەواند، بە دوای گەرماییەکەیدا دەگەڕا، هیوای بە دڵدانەوەیەکی ڕەق دەخواست کە لەو کاتەدا فیشەکێکی تریش تەقێنرا. مانولو توند میکوێلی لە باوەش گرتبوو تا ئاگاداربێ لێ نەگەڕێ لەو باڵندە موردەنییە و لاشەکەی دایک نزیکتر بێتەوە کە ئێستا بە جۆرێک نیوە هەلاهەلا بووبوو، کە هیچی بەسەر هیچەوە نەمابوو.

